# عەقیدەی ئیسلامی لەسەر ڕاڕەوی

## اَهْل السُّنَّةِ وَ الْجَماعَةِ




دانانی/ عبد الله عبد العزيز هەرتەلی

www.iqra.ahlamontada.com
منتدى إقرأ الثقافي
www.iqra.ahlamontada.com
للكتب ( كوردى ,عربي ,فارسي )

# عەقیدەی ئیسلامی
# لەسەر ڕاڕەوی
# ﴿ أَهْلِ السُّنَّةِ وَالْجَمَاعَةِ ﴾

دانانی/ عبد الله عبد العزیز هەرتەلی

چاپی دووەم

- جمادی الآخرة - ١٤١٥ - کۆچی
- گەلاڕێزان - ٢٦٩٤ - کوردی
- تشرینی دووەم - ١٩٩٤ - زایینی

چەند زانستیکی بەسود لە پەراوێزەکانیدا زیادکراوە

www.iqra.ahlamontada.com

# پێشەکی

﴿ بسم الله الرّحمن الرحيم ﴾

اَلحَمْدُ لله ربّ العالمين. وَالصَّلاةُ والسّلام علىٰ سَيدنا مُحَمدٍ واله وصحبه أجمَعين.

ئەی موسڵمانی خۆشەویست: خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا فەرمویەتی: ﴿وما خَلَقْتُ الجِنَّ وَالْأِنْسَ الاَّ لِيَعْبُدُونِ﴾ ٥٦ (الذاريات) من جنۆکەو نادەمیزادم بۆ هیچ دروست نەکردوە، تەنها بۆ ئەوەنەبێ کە بمپەرستن. هەروەها فەرمویەتی: ﴿إنّا أنْزَلْنا اِلَيْكَ اْلكِتابَ بِالْحَقِ فأعْبُدِ اللهَ مُخْلِصاً لَهُ الدّين﴾ ٢ (الزمر) ئێمە قورئانمان بۆ تۆ ناردوّتە خوارەوە، بۆ ئەنجامدانی راستی، کەوابوو: خوا بپەرستەو، ئایینەکەت بەبێ گەردی هەر بۆخوابێ.

ئاشکرایە: خوای گەورە، حەزرەتی (محمد)ی ﷺ لە (مەککە) کردە پێغەمبەر، لەکاتێکدا. کەدانیشتوانی مەککە خوایان ئەناسیو، خوایان ئەپەرست، بەڵام خوا پەرستی یەکە، بەبێ گەردی نەبوو، بەڵکو هاوبەشیان بۆ خوادائەناو، ئەیانگوت: ﴿مانَعْبُدُهُمْ الاَّ لِيُقَرِّبُونا اِلىٰ اللهِ زُلْفىٰ﴾ ٣ (الزمر) ئێمە تەنها لەبەر ئەوە ئەم بتانە ئەپرستین، تاکو لەخوامان نزیك بکەنەوە. بەڵام خوای گەورە بەم پەرستنە هاوبەشە رازی نەبوو، فەرموی: ﴿وَمَنْ يُشْرِكْ بِاللهِ فَقَدْ ضَلَّ ضَلالاً بَعيداً﴾ ١١٦ (النساء) هەرکەسێ هاوبەش بۆ خوا دابنێ، بەراستی گومرابووە، گومرا بوونێکی دوور لە رێگەی راست. ئینجا بزانە: هەروەك خوای گەورە رازی نەبوو لەپەرستن دا هاوبەشی بۆ دابندرێ، بەوەش رازی نەبوو: کە لەدادرەوایی (حاكميّة)دا هاوبەشی بۆ دابندرێو، فەرموی: ﴿اِنِ الْحُكْمُ الاَّ لِلهِ اَمَرَ اَلاَّ تَعْبُدوا الاَّ اِيّاهُ ذٰلِكَ الدّينُ اْلقَيِّمَ﴾ ٤٠ - (يوسف) دادرەوایی (حاكمية) تەنها مافی خوایە، فەرمانی داوە جگە لەوی هیچ کەسی تر نەپەرستن و بەدادوەری (حاکم) دانەنێن، ئائەوە ئایینی راستەقینەیە.

هەروەها فەرمویەتی: ﴿اِنّا أنْزَلْنا اِلَيْكَ اْلكِتابَ بِاْلحَقِّ لِتَحْكُمَ بَيْنَ النّاسِ بِما اَراكَ اللهُ﴾ ١٠٥ (النساء) ئێمە قورئانمان بۆ تۆ ناردوّتە خوارەوە، تاکو داد لە نێوان ئەم خەڵکە دا بکەی، بەو یاسایەی خوافێری کردوی. جا لەم ئایەتە پیرۆزانەدا بۆمان دەرکەوت: کە جیاوازی نیە لە نێوان ئەو کەسەی باوەڕی بەتاك و تەنیایی خوانیە، وەلە نێوان ئەوکەسەی باوەڕی بەیاسای خودانیە، واتە: هەردووکیان کافرن (جابزانە) سەحابەی پێغەمبەر ﷺ لەسەر (عَقيدَة)یەکی بێ گەردبوون و، تەنها خوای گەورەیان بە پەرستراوو، دادوەر ئەزانیو، باسی خوای گەورەیان بەسیفەتی پاك و، بەرز ئەکرد.



www.iqra.ahlamontada.com

چینی دوای سەحابەش هەر بەم شێوەیە بوون. ئینجا هەر لەسەدەی یەکەم دا چەند چینێکی سەر لێشێواو هاتنە گۆرەپانی ئیسلام و، قسەی پوچەڵ و نارێکیان بڵاوئەکردەوە. وەکو (مُعْتَزِلَة) و (قَدَرِيَة) و (جَبْرِيَة) و (قَرامِطَة) و (خَوارِج) و. هتد:
بەڵام سەر لێشێواوی ئەم چینانە کاری نەکردە سەر دادرەوایی ئیسلام، چونکە هەر قورئانی پیرۆز یاسای موسوڵمانان بوو، (خَلِيفَة) واتە: جێنیشی پێغەمبەر ﷺ بەیاسای قورئان خەڵکی بەرێوە ئەبرد. ئینجا لە جەنگی جیهانی یەکەم دا، کافرەکان بەسەر مرسوڵمانان دا زاڵ بوون و، یاسای قورئانیان لەکار خست و، یاسا دەستکردی خۆیان خستە ناو موسوڵمانان و (خِلافة) ی ئیسلامی‌یان رووخاندو (عەقیدە)ی موسوڵمانانیان تێك دا. ئا بەم جۆرە کافرەکان لە پیلانەکانیان دژ بە ئیسلام هەر بەردەوامن. خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿وَلَا يَزالُونَ يُقاتِلُونَكُمْ حَتىَ يَرُدُّوكُمْ عَنْ دِينِكُمْ اِنِ اسْتَطاعُوا﴾ ٢١٧ (البقرة) کافرەکان واز ناهێنن هەر جەنگتان لەگەڵ ئەکەن، تا لە ئایینی خۆتان لاتان ئەدەن ئەگەر بتوانن. جا لە ئەنجامی روخانی (خِلافة) و، تێك چونی (عقیدە)ی موسوڵمانان، دوو چینی زۆر خراپ لەناو موسوڵمانان سەریان هەڵداو، بوونە کۆسپ لە رێگەی یەکگرتنی موسوڵمان و، لەرێگەی بانگەوازی (جهاد) بۆ گەراندنەوەی دادرەوایی خوا. ئەمەش هەردوو چینەکانن. (١).
یەکەم: کاربەدەستە (منافقەکان) دوو رووەکان.
ئاشکرایە: لە (١٦)ی ئایاری (١٩١٦) وڵاتە کافرەکان رێککەوتننامەی (سایکس - بیکۆ) یان مۆرکردو، وڵاتی ئیسلامیان پارچە پارچە کرد، جا لەسەر هەر پارچەیەك نۆکەرێکی خۆیان کردە فەرمانرەوا، بۆ ئەوەی بە یاسا دەستکردی ئەوان رەفتار بکەن و، خەڵکی لە ئیسلام دووربخەنەوە، ئەم چینە بەشێوەیەکی واگومرابوون. وەك خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿وَاِذا قِيلَ لَهُمْ تَعالَوْا اِلىٰ ماأَنْزَلَ اللهُ وَاِلىٰ الرَّسُولِ رَأَيْتَ اْلمُنافِقِينَ يَصُدُّونَ عَنْكَ صُدُوداً﴾ ٦١ (النساء) کاتێ پێیان ئەگوترێ: وەرن بەم قورئانە خەڵکی بەرێوەببەن، وەرن شوێنکەوتووی پێغەمبەربن، ﷺ. ئەبینی (منافقەکان) ئەبنە کۆسپ و، خەڵکی قەدەغە ئەکەن لە رێبازەکەی تۆ، واتە: رێبازی

(١) پیاوێکی تورك کەناوی (مصطفی کمال، اتاتورك) بوو، نۆکەرێکی (انگلیز) بوو لە تورکیا، خۆی‌و، دارو دەستەکەی بریارێکیان دەرکرد بۆ روخاندنی (خلافة)ی ئیسلامی لە (٣)ی ئازاری (١٩٢٤)ی زایینی‌و، (خلیفة)ی ئیسلام کەناوی (عبد المجید الثانی) بوو: دەستگریان کردو، ناردیانە دەرەوەی تورکیا، ئایین و رەوشت و بەرگی ئیسلامیان قەدەغەکرد، ئا بەم کردارە دژ بە ئایینە (معجزە)ی پێغەمبەر ﷺ هاتە جێ کە ئەفەرموێ: (اَوَّلُ مَنْ يَسْلِبُ أُمَّتِي مُلْكَهُمْ وَماخَوَّلَهُمُ اللهُ بَنُو قَنْطُوراء) رواه الطبرانی وابو نعیم عن ابن مسعود رضی الله عنه، واتە: یەکەم کەس کە دەسەلات و دەوڵەتی ئوممەتم لا ئەبا: نەتەوەی قەنتورایە«(قنطوراء) کە نیزمیەکی (ابراهیم) پێغەمبەرە ﷺ تورکەکان لەم کەنیزمیە پەیدا بوون. دانەر



www.iqra.ahlamontada.com

پێغەمبەر ﷺ نۆکەرایەتی کوفرو، رەگەز پەرستیو، ستەم کاریو، کوشتن و، برینی موسولمانان و، نوێژنەکردن و، مەیخۆریوبێناموسیو، بێ شەرمی: پیشەی ئەم کاربەدەستانەیە ﴿وَاِذا قيلَ لَهُمْ لا تُفْسِدُوا فِي الْأَرضِ قالُوا اِنَّما نَحْنُ مُصْلِحُونِ﴾ ١١ (البقرة) کاتێ پێیان ئەگوترێ ئەم وێرانکاری‌یە مەکەن، ئەڵێن: ئێمە چاکە خوازین و، بەرژوەندی کۆمەلمان ئەوێ ﴿اَلَا اِنَّهُمْ هُمُ الْمُفْسِدُونَ ولَكِن لايَشْعُرُونَ﴾ ١٢ (البقرة) ئاگادار بە: ئەوانە تێکدەرن، بەلام هەست ناکەن. جا بۆ ئەوەی بتوانن فێلْ لە موسولمانان بکەن و، فەرمانی کافرەکان جێبەجێ بکەن، ناسنامەی ئیسلام هەلئەگرن و ئەلێن: ئێمە موسولمانین ﴿وَاِذا لَقُوا الَّذينَ آمَنُوا قَالُوا آمَنَّا وَاِذا خَلَوْا اِلىٰ شَياطِينِهِمْ قالُوا اِنَّا مَعَكُمْ اِنَّما نَحْنُ مُسْتَهزِؤُونَ﴾ ١٤ (البقرة) کاتێ ئەم کار بەدەستە منافقانە ئەگەنە موسولمانان، ئەڵێن: ئێمەش موسولمانین، کە ئەگەرێنەوە لای هاوڕێو ئاغا شەیتانەکانی خۆیان، ئەلێن: ئێمە لەگەلْ ئێوە داین و، دژ بە ئیسلامین و، ئێمە گاڵتە بەموسولمانان ئەکەین. جا ئەی موسولمانی خۆشەویست: دۆستایەتی لەگەلْ ئەم نۆکەرانە دروست نیەو، دژایەتی‌یان واجبە، چونکە دوژمنی ئیسلامن، کەوابوو: چارسەرکردن هەر راپەرینە، لەدژی ئەو (منافقانە)،

(عن مُعَاذ بن جَبَل رضي الله عنه، قال النبي ﷺ: اَلَا اِن السُّلْطانَ وَالْكِتَابَ سيَفْتَرِقَانِ فَلا تُفَارِقُوا الكِتابَ، اَلَا اِنَّه سَيَكُونُ عَلَيْكُمْ اُمَراءُ اِنْ اَطَعْتُمُوهُمْ اَضَلوكم، وَاِنْ عَصَيْتَمُوهُمْ قَتَلوكُمْ، قالوا: فما نَصْنَعُ يارَسُولَ اللهِ؟ قال: كَما صَنَعَ اَصْحابُ عيسى، حُمِلوا عَلىٰ الْخُشُبِ وَنُشِرُوا بِالْمَناشير، مَوْتٌ في طاعةِ اللهِ خَيْرٌ مِنْ حَياةٍ في مَعْصِيَةِ اللهِ﴾ أخرجه ابن راهَوَيْهِ: واتە: ئاگادار بن: دەستەلات و قورئان لێك جیائەبنەوە، بەلام ئێوە خۆتان لە قورئان جیامەکەنەوە، ئاگادار بن: لەمەودوا چەند کار بەدەستێکی گومرابوو، فەرمانرەواییتان بەسەردا ئەکەن، ئەگەر گوێرایەلیان بن گومراتان ئەکەن، وە ئەگەر لە فەرمانیان دەرچن ئەتانکوژن، یارەکان گوتیان: ئێمە چ بکەین ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ؟ فەرمووی: وەکو هاوڕێکانی (عیسا) پێغەمبەر ﷺ رەفتار بکەن. ئەوان لە قنارەدران و، بەمشار لەت لەت کران، وازیان لە ئایین نەهێنا، مردنێك لە خوا پەرستی دابێ باشترە لە ژیانێك کە لە دژایەتی خوا دابێ.

دووەم: پاشکۆی ئەو کاربەدەستە منافقانە، کە لە ناو بەرگی ئایینی‌دا خۆیان شاردۆتەوە، هەروەك پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ پێناسەی کردوون (عن أبى هريرة رض الله عنه قال النبي ﴿ﷺ﴾ يخرُجُ في آخر الزَّمانِ رجالٌ يَخْتِلُونَ الدُّنْيا بالدِّين يَلْبَسُونَ للناس جلُودَ الضأنِ من اللِّين وَاَلْسِنَتُهم أحلىٰ من السُّكرِ وقلُوبُهُمْ قلوبُ الذِّئابِ) رواه الترمذي. لە کۆتایی زەمان دا چینە پیاوێك دەردێن، بە ناوی ئایین دونیا کۆئەکەنەوە



www.iqra.ahlamontada.com

و، بۆ ئەوەی فێڵ لە خەڵك بکەن، پیستەی مەڕ ئەکەنە بەر، ئەوەندە نەرمی ئەنوێنن، وەزمانیان لە شەکر شیرینترە، بەڵام دڵیان دڵی گورگە.

جا بۆ ئەوەی ورگ و دامەنیان تێر بێ، خۆیان کردوتە داردەستی ئەو کاربەدەستە ستەمکارانەو، بە تەشی ئەوان ئەرێسن و، بە زورنای ئەوان هەڵپەرکێ ئەکەن و، خەڵکی هان ئەدەن بۆ ملکەچی و، گوێڕایەڵی بۆ ئەم ستەمکارانە، ئایا نازانن بەم کردارە لە ڕێبازی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ لایانداوە؟ (عن كعب رضي الله عنه قال النبي ﴿ﷺ﴾ انهُ سَتكُون بَعْدي أُمراءُ مَنْ صَدَّقَهم بكَذِبِهِمْ وَأَعانَهُم علىٰ ظُلْمِهمْ فَلَيْسَ مِنِّي وَلَسْتُ مِنهُ وَلَيْسَ بوارِدٍ عَلَيَّ الحَوْضَ) رواه النسائي. بێگومان لە دوای من چەند کاربەدەستێك دێن، هەر کەسێ بە درۆی ئەوان باوەڕ بکاو، یارمەتییان بدا لەو ستەمکارییەی ئەوان ئەیکەن، ئەو کەسە لە من نیەو، منیش لەوی نیم، لە حەوزی کەوسەر نابێتە میوانم.

زیانی ئەم چینە لەوەدایە: کە بەناوی ئایین خۆیان ئەهێننە بەرچاوو، فتوای بە درۆ ئەدەن و، خەڵکی گومرا ئەکەن و، بە خۆشیان هەر گومرانە، چونکە یاسای دەستکرد وەکو یاسای خوادا ئەنێن و، شوێنکەوتوی ئەبن، (اَفَحُكْمَ الجاهِلِيَّةِ يَبْغُونَ وَمَنْ أَحْسَنُ مِنَ اللّهِ حُكْماً لِقَوْمٍ يُوقِنُون) ٠|ئایا داوای دادی سەردەمی نەفامیو کوفر ئەکەن و، بە دادی خودا ڕازی نابن؟ ئایا لە دادڕەوایی دا. کێ لە خوا باشترە؟ لەلای گەلێکی وا کە بیرو باوەڕی تەواوی بە خوا هەبێ. ئا بەم جۆرە یاسای خودایان خستوتە پشت گوێ و لەناو گومراییو (جاهِلِيّە)تی سەدەی بیستەم دا مەلەوانی ئەکەن و، شوێنکە و تووی (فِرْعَوْنە)کانی سەدەی بیستەمن. جا هەروەکو (فِرْعَوْن) لە ڕۆژی قیامەت پێشڕەوی گەلی خۆیەتی بۆ جەهەننەم:

فیرعەونەکانی ئەم سەردەمەش پێشڕەوی ئەم چینەی دووەمن بۆ ئاگری دۆزەخ. بڕوانە ئایەتی (٧١ـ الاسراء). جا ئەی موسوڵمانی خۆشەویست: ئیمڕۆ ڕۆژی یەکگرتن و تێکۆشانە بۆ ڕزگارکردنی ئایینی ئیسلام و، بۆ ڕزگارکردنی چەوساوەکان لە بەندایەتی بەندە، تاکو بکرێنە بەندەی خودا.

ئاشکرایە: ئەبێ ئەم یەککرتنەو تێکۆشانە لەسەر بناغەی (عَقیدَة)یەکی ڕاست و بێگەردبێ، وەکو (عقیدة)ی (السلف الصالح). ئینجا بۆ ئەم مەبەستە پاکە ناوی خوام لێهێناو، دەستم کرد بەدانانی (عقیدَة)یەك لەسەر ڕا ڕەوی (السلف الصالح) چونکە بەڕاستی ئەوان پێشەوای (اهل السنة والجماعة)ن. وەلە هەمان کاتدا ئەم (عقیدة) یەم کردە ڕوونکەرەوەی هەڵبەستەکانی (ایمانوإسلام) کە دانراوی خۆم بوو. وەشێوەی ڕوونکردنەوەم بەم جۆرەیە:



www.iqra.ahlamontada.com

لەچەند باغێك لە باغەکانی قورئان و حەدیس، گوڵێك، یان زیاترم چنیوەو، لەناو ئەم مەرکانەیەم داناوەو، پێشکەش بە ئێوەی بەرێز ئەکەم، بۆ ئەوەی دڵنیات بکەم و (عَقِیدَه)یەکی بێگەرد لەناو دڵت دا جێگیر بێ. بەڵام: ناڵێم (عَقِیدَه)ی ئیسلامیم بەدرێژی نوسیوەو، ناڵێم هەموو باسەکان ماڧ خۆیان دراوەتێ، بەڵکو: ئەم نامیلکەیە وەکو ناوەرۆکێکە بۆ کتێبە درێژەکان. جا بۆ پێکهێنانی ئەم نامیلکەیە سودم لەم سەرچاوانە وەرگرتوە.

١- (شرح صحيح مسلم) دانراوی (الامام النواوی)

٢- (الأتقان في علوم القران) دانراوی (جلال الدين السيوطي)

٣- ﴿اَلْفتاوىٰ الْحدِيثِيّة﴾ دانراوی ﴿اَلعلاّمَةِ اِبن حَجَرِ الْهَيْتَمى﴾.

٤- (التاج الجامع للاصول وشرح غاية المأمول) دانراوی (الشيخ منصور على ناصف)

٥- (نثر اللآلى) دانراوی (عبدالحميد الآلوسى)

٦- (مختصر شرح العقيدة الطحاوية) دانراوی (صلاح احمد السامرائى)

٧- (تحفه المريد على جوهرة التوحيد) دانراوی (ابراهيم البيجورى)

٨- (كتاب التوحيد) دانراوی (عبدالمجيد الزندانى)

٩- (المصطلحات الاربعة) دانراوی (ابو الاعلى المودودى)

١٠- (فقه السيرة) دانراوی (د: محمد رمضان البوطى)

جا ئەی موسوڵمانی خۆشەویست: تکات لێ ئەکەم ئەگەر هەڵەیەکت چاوپێکەوت راستی بکەوەو، چاوپۆشی لەکەم و کوری‌یەکانم بکەو، تەواویان بکە، وەئەگەر شتێکت بەدڵ نەبوو، یان گومانت لێی هەبوو،لەخۆتەوە هیچ بریارێك مەدە، تا تەماشای ئەم سەرچاوانە ئەکەی، دووبارە تکات لێ ئەکەم: کە هەڵبەستەکانی (ئیمان و ئیسلام) فێری مناڵەکانت بکەی، تاکو لەبەری بکەن و، هەردووکمان لە پاداشدا هاوبەش بین، ئیتر لەخوا ئەپارێمەوە: ئەم دانراوە، کەناوم ناوەبە (عەقیدەی ئیسلامی) بیکاتە دانراوێکی سودبەخش و، زیاتر یارمەتیم بدا بۆ خزمەتی ئایینی ئیسلام. آمین.

عبدالله عبدالعزيز هەرتەلی

هەولێر - کوردستان

مانگی (محرم) ١٤١٤ کۆچی



www.iqra.ahlamontada.com

## «پێشەكی یەكەی ئیمان و ئیسلام»

| | |
|---|---|
| بەناوی خودای گەورەو میهرەبان | دانەری زەمین ڕاگری ئاسمان |
| هەزاران سەلات هەزاران سەلام | لەسەر (محمد) پێشەوای ئیسلام |
| هەم لەسەر ئال و سەحابەی نازدار | هەتا حەز ئەكا خودای كردگار |
| ئومێدم وایە لە بۆ كورد زمان | نەختێك لە ئاین بنوسم بۆیان |
| چونكە پێویستە لەسەر موسوڵمان | بۆ خۆی بزانی ئیسلام وئیمان |

● (باسی بنچینەكانی ئاین) ●

خودامان (الله) ئیسلام دینمانە ● هەروا (محمد) ﴿ﷺ﴾ پێغەمبەرمانە.

هەرسێك بنچینەكانی ئاین، لەم حەدیسەدا كۆكراونەوەو، پێویستە هەموو كەس بیانزانی (عن العباس رض الله عنه قال النبي ﷺ :ـ ذاقَ طَعْمَ الْأيمانِ مَنْ رَضِيَ باللهِ رَبّاً، وَ بالْأسلامِ دِيناً. وَبمحمَّد رسَوُلاً) رواه مسلم. واتە:ـ ئەو كەسەتامی ئیمان ئەكاو لە ناو دڵی داجێگیر ئەبێ كە رازی بێ:ـ خوای گەورە دادوەر و پەرستراوی بێ، ئیسلام یاسای ژیانی بێ (محمد) ﴿ﷺ﴾ پێغەمبەرو پێشەوای بێ.

## « پلەكانی ئاین »

بزانە:ـ ئاین سێ پلەی هەیە:ـ اسلام، ایمان، إحسان، ئەم سێ پلەیە لە حەدیسە درێـژەكـەی (جبـرائیـل) وەرگـیراون كە (بخاریو مسلم) گێراویەتیانەوە جا ئێمە بەدرێژی ئەم سێ یانە روون ئەكەینەوە (ان شاء الله تعالی).

## «ئیسلام و ڕوكنەكانی ئیسلام»

| | |
|---|---|
| ئیسلام پێنج بەشە پێی ئەڵێن ئەركان | یەكەمیان وشەی شەهادەو ئیمان |
| دووەم پێنج نوێژە، سێ یەم زەكات دان | چوارەمین ڕۆژووی مانگی رەمەزان |
| پێنجەمین (حەججە) لەم پێنج ڕوكنانە | بۆ ژن و پیاو گشتی یەكسانە |

ئیسـلام:ـ ملكـەچی یە بۆ خوای گەورە، واتـە:ـ فەرمـانی جێ بەجێ بكەیو قەدەغـەی نەشكێنیو، ئەو رێبـازەی ناوی ناوە بە ئیسلام پێی دا برۆی بەم لاو بەولادا، لانەدەی، خوای گەورە فەرمویەتی:ـ (إِنَّ الدِّينَ عِنْدَ اللهِ الْأَسْلَامِ) ١٩ (آل عمران) بێگومان ئایینی تەواو لەلای خوا ئیسلامە. هەروەها ئەفەرموێ (وَأَنَّ هذا صِراطِي مُسْتَقِيماً فَاتَّبِعُوهُ وَلاتَتَّبِعُوا السُّبُلَ فَتَفَرَّقَ بِكُمْ عَنْ سَبِيلِهِ) ١٥٣ (الانعام) ئەم ئیسلامە رێگە راستەكەی منە، كە وابوو:ـ شوێن ئەم رێگە راستەكەون و، شوێن رێچكە دەستكردەكان مەكەون، چونكە پەرتەوازەتان ئەكەن و لە رێگەی خوا لاتان ئەدەن. هەروەها فەرمویەتی:ـ (وَمَنْ يَبْتَغِ غَيْرَ الْأَسْلامِ دِيناً فَلَنْ يُقْبَلَ مِنْهُ وَهُوَ فِي



www.iqra.ahlamontada.com

ٱلْآخِرَةِ مِنَ ٱلْخَاسِرِين) ٨٥ (آل عمران) هەرکەس بیەوێ جگە لە ئیسلام دەست بە بەرنامەیەکی تربگرێ لێی وەرناگیرێ‌و، لەرۆژی دواییدا لە زەرەرمەندەکانە.

ئینجا هەر وەکو خوای گەورە ئایینی ئێمەی ناو ناوە بە ئیسلام، ناویشی لەو کەسانە ناوە (موسوڵمان) کە دەست بەم ئایینەوە ئەگرن، خوای گەورە فەرمویەتی (هُوَ سَمَّاكُمُ المُسْلِمينَ مِنْ قَبلُ وَفِي هٰذا) ٧٨ (الحج) خوای گەورە ناوی لە ئێوە ناوە موسوڵمان پێش هاتنی قورئان، وەلە قورئانیشدا ناوی هێناون بەموسوڵمان.

ئیسلام لە پێنج روکن پێك هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ دیاری کردون و ئەفەرموێ (الأَسْلامُ. اَن تَشْهَدَاَنْ لاَ الهَ الاّاللّٰهُ وَاَنّ مُحَمَّداً رَسُولُ اللهِ. وَتُقيمَ الصَّلاة. وَتُؤتِيَ الزكاة. وَتصُومَ رَمَضان وَتَحجَّ ٱلْبَيْتَ اِن استَطعْتَ اِلَيْهِ سَبيلاً) رواه البخاري ومسلم. واتە:- ئیسلام لەم پێنج بەشانەپێك هاتوە. یەکەم:- شادە هێنان. بلێ:- اَشْهَدُ اَن لاّ اِلٰهَ اِلاّ اللّٰهُ وَاَشْهَدُ اَنَّ مُحَمَّداً رَسُولُ اللّٰهِ. دووەم:- نوێژکردن. سێیەم، زەکات دان چوارەم:- بەرۆژوو بوونی رەمەزان پێنجەم‌حەج کردن‌ئەگەر توانای چون و هاتنەوەی هەبێ.

## ١- « مانای ووشەی شەهادە »

أشهد أن لا الٰه الا اللّٰه وأشهدُ اَن مُحَمَّداً رَسُولُ اللّٰه

**ئەڵێم بەزوبان، گومانم نیە ● جگە لە (الله) هیچ خودا نیە**

**هەروا (محمد) نێرد راوی خوایە ● ئەو پێغەمبەری هەموو دونیایە**

گوتنی هەردوو وشەی شەهادە، یەکەم روکنی ئیسلامە (أَشْهدُ)من بەدڵ و بەزوبان شایەدی ئەدەم و ئەڵێم (اَنْ لاَ اِله) هیچ خودایەك نیە (اِلاّ اللّٰهُ) تەنها زاتی (الله) خودایە، کەواتە:- جگە لەو خودایە هیچ پەروەردگارێك و هیچ پەرستراوێك، هیچ دادوەرێك نیە (بزانە) ئەم وشەیە پێی ئەگوترێ (كَلِمةُ التّوحيد) واتە:- وشەی یەکتاپەرستی، چونکە:- هەموو پێغەمبەرەکانی خوا صلى اللّٰهُ عَلَيهم أجمعين بانگەوازی یان بۆ ئەم وشەیە کردوە بەو سێ واتەیەی گوتمان... خوای گەورە فەرمویەتی (وَمَا اَرْسَلنا مِنْ قَبْلِكَ مِنْ رَسُولٍ اِلاَّ نُوحي اِلَيْهِ اَنّهُ لا اِلٰه اِلاَّ انا فأعْبُدُون) ٢٥ (الأنبياء) واتە: ئەی محمد ﷺ پێش ناردنی تۆهەر پێغەمبەرێکمان نارد بێ، پێمان راگەیاندوە کەجگە لە خۆم هیچ خودایەك نیە، کەوابووئەتەنها من بپەرستن و، بەداد وەرم دابنێن. بروانە لاپەرە (٢٠).

کەوابوو:- هەرکەسێ کەسێکی تر جگەلە خودا بپەرستی، یان بەداد وەری دابنێ‌و شوێنکەوتوی بێ، یەکتاپەرستی لە دەست ئەچی‌و ئەبیتە (مُشْرك) واتە: دانەری

www.iqra.ahlamontada.com

هاوبەش بۆ خوا. هەروەك خوای گەورە فەرمویەتی (وَإِنْ أَطَعْتُمُوهُمْ إِنَّكُمْ لَمُشْرِكُونَ) ۱۲۱ (الأنعام) ئەگەر گوێڕایەڵی ئەوان بن لە حەرام و حەلال، بێگومان ئێوە (مُشرِكن) واتە: هاوبەشتان بۆ خواداناوە (وَأَشْهَدُ) دووبارە بەدڵ و زوبان شایەدی ئەدەم و ئەڵێم (أَنَّ مُحَمَّداً) بێگومان حەزرەتی (محمد ) (رَسُولُ اللهِ) نێردراوی خوایە. خوای گەورە کردویەتیە پێغەمبەر، ناردویەتی بۆ لای ئادەمیزادو، جنوکە، تاکو ئایینی ئیسلامیان پێ رابگەیەنیو، تێیان بگەیێنی کە هەر ئیسلام بەرنامەی ژیانەکە وابوو: هەر (محمد) ﷺ رابەری راستە قینەیەو، جگە لە راستەرێ یەکەی محمد ﷺ هەموو رێچکەکانی تر سەر لێشێواوی و گومراییە، خوای گەورە فەرمویەتی (فَآمِنُوا بِاللهِ وَرَسُولِهِ النَّبِيِّ الأُمِّيِّ الَّذِي يُؤْمِنُ بِاللهِ وَكَلِمَاتِهِ وَاتَّبِعُوهُ لَعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ) ۱۵۸ (الاعراف) ئەی خەڵکینە باوەڕ بێنن بە خواو بە پێغەمبەری خوا کە نەخوێندەوارەو باوەڕی بە فەرمودەکانی خوا هەیەو، شوێن ئەو پێغەمبەرەکەون، تاکو بگەنە رێگەی راست و لە گومرایی دوور کەونەوە.

(ئاگاداری) گوتنی ئەم دوو وشەیە مەرجە بۆ بڕیاردان بە ئیسلامیەتی، کەوابوو:- ئەگەر کافرێك بیەوێ موسوڵمان بێ، ئەبێ ئەم دوو وشەیە، بەیەکەوە، بەدوای یەکتردا بڵێ، وەهیچ جیاوازی نیە لە نێوان کافری بنە ڕەتیو، لە نێوان ئەو موسوڵمانەی کافربووە.

## ٢- « باسی نوێژ »

| | |
|---|---|
| پێنج نوێژ پێویستە لەسەر موسوڵمان | بیکاشەوو ڕۆژ تەنها بۆیەزدان |
| هەر کەس نوێژ نەکاد وژمنی خوایە | چونکە کۆڵەکەی دینی ڕمایە |
| نیوەڕۆو، عەسر هەر یەك چوار ڕەکات | نوێژی ڕۆژ ئاوا، بیکە سێ ڕەکات |
| هەر واچوار ڕەکات نوێژی عیشایە | بەیانیان دووە، فەرمانی خوایە |
| دەستنوێژت بشۆ، بەرگت خاوێن بێ | لەگەڵ جێگەی نوێژ، ڕووت لە قیبلە بێ |
| نیەتی نوێژ بێنەو، جمو جوڵ مەکە | بێ پێکەنین بەو، گفتو گۆمەکە |

نوێژ دووەمین ڕوکنی ئیسلامە خوای گەورە فەرمویەتی (فَأَقِيمُوا الصَّلَاةَ إِنَّ الصَّلَاةَ كَانَتْ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ كِتَاباً مَوْقُوتاً) ۱۰۳ (النساء) نوێژ بکەن، بێگومان نوێژ لەسەر موسوڵمانان واجب کراوەو کاتی بۆ داندراوە.

ژمارەی نوێژە واجبەکان. پێنج نوێژە لە هەموو شەوو ڕۆژێکدا (عن انس رضي الله عنه قال فُرِضَ عَلَى النَّبِي ﴿ﷺ﴾ لَيْلَةَ الإِسْرَاءِ الصَّلَوَاتُ خمسِينَ، ثُمَّ نُقِصَت حَتَّى جُعِلَتْ خَمْساً) رواه البخاري ومسلم، لە شەوی شەو ڕۆیی و سەرکەوتن بۆ



www.iqra.ahlamontada.com

ئاسمـان، پەنجا نوێژ لەسەر پێغەمبەرو ئوممەتی واجب کرا، ئینجا هەر لێی کەم کراوە، تاکرایە پێنج نوێژ لە هەموو شەوو ڕۆژێکدا.

(سـزای نوێـژ نەکەر): زانایانی ئیسلام لەسەردەمی سەحابەوە، تا ئێستا یەك دەنگن: کە هەر کەسێ باوەڕی بە واجب بوونی نوێژنەبێ و ئەوە کافرە، کەوابوو: داوای موسوڵمان بوونەوەی لێ ئەکرێ جا ئەگەر موسوڵمان نەبووەوە؛ ئەکوژرێ و لە گۆڕستانی موسوڵمانان نانێژرێ. بەڵام ئەگەر باوەڕێ بەواجب بوونی نوێژ هەبوو، لە بەر تەمبەڵی نوێژی نە ئەکرد: ئیمامی (أحمد) ئەفەرموێ: ئەوەش کافرە (عن جابر رضي الله عنه قال النبي ﴿ﷺ﴾ اِنَّ بَيْنَ الـرَّجُلِ وَبَيْنَ الشِرْكِ وَالْكُفْر تَرْكَ الصَّلاَةِ) رواه مسلم.

سنوری نێوان مرۆڤ و کافربوون نوێژ نەکردنە، وەهەرسێك ئیمامەکانی ترفەرمویانە:

ئەم نوێژ نەکەرە کافرنیە، ئەگەر شادەی هێنا بێ (عن انسٍ رضِ الله عنه قال النبي ﴿ﷺ﴾ يَخْرُجُ مِنَ النَّار مَنْ قالَ لاَ اِلَه الا الله وَفِي قَلْبِه وَزْنُ شَعيرَةٍ مِن إيمانٍ) رواه البخـاری و مسلم. هەر کەسێ شادەی هێنـا بێ و بەگرانایی دەنکە جۆیەك باوەڕی بەخواو پێغەمبەر هەبێ: ئەوە لە ئاگری دۆزەخ دێتە دەرەوە، کەوابوو: ئەم نوێژنەکەرە فاسقە، کافرنیە.

جا ئەگەر گەورەی موسوڵمانان فەرمانی نوێژکردنی بەم نوێژ نەکەرەکردو، ئەویش نوێژی نەکرد: ئیمامی (مالك) وئیمامی (شافعی) فەرمویانە؛ ئەبێ بکوژرێ، چونکە خوای گەورە فەرمـویەتی (فَاِنْ تَابُوا وَأقامُوا الصَّلاَةَ وَآتَوُا الزَّكَاةَ فَخَلوّا سَبيلَهُم) ٥ (التوبه) ئەگەر تۆبەیان کردو، نوێژیان کردو، زەکاتیان دا؛ وازیان لێ بێنن، واتە:ـ ئەگەر نوێژیان نەکرد بیان کوژن، بەڵام ئیمامی (أبو حَنيفَه) فەرمویەتی: دروست نیە بکوژرێ، بەڵکو ئەبێ بەندبکرێ تانوێژ ئەکا. ئینجا بزانە:ـ هەر جۆرە نوێژ نەکەرێك بێ واجبە نوێژەکان قەزابکاتەوە (عَنْ عَلِيِّ رضِي الله عنه: اَنَّهُ شُغِلَ النبيُّ عَنْ صَلاةِ العَصْرِ يَوْمَ الأحـزاب ثُمَّ صَلاهـا بَيْنَ اَلعِشـائَيْنِ) رواه البخاری و مسلم. پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ لە جەنگی (خَندق) نوێژی عەسری لە دەست چوو، ئینجا لە نێوان مەغرید و عیشادا نوێژەکەی کرد.

## ٢- « باسی زەکات »

زەکات ئەمەیە ئەی برای نازدار    هەر کەس زەنگینە، لە ساڵێ یەك جار
نەختێك ماڵی خۆی بەدڵێکی شیرین    بیداتە هەژار، هیچ نەبێ غەمگین
وەکو گەنم و جۆ، هەم زێڕو پارە    هەروا بزن و مەڕ، ژمارەیان دیارە
ئینجا سەر فیترەی مانگی ڕەمەزان    لە جیاتی خۆتان، ژن و منداڵتان
نزیك دوو کیلۆ گەنمی پاك کراوە    یانرخی ئەوە بڕیار دراوە



www.iqra.ahlamontada.com

زەکات سێیەمین روکنی ئیسلامە، لە مانگی (شوّال) ساڵی (٢)ی کۆچی واجب کراوە، خوای گەورە ئەفەرموێ (وَأَقِيمُوا الصَّلاةَ وَآتُوا الزَّكَاةَ) ٤٣ (البقرە) نوێژ بکەن وزەکات بدەن، کەوابوو: هەر کەس بڵێ:ـ زەکات واجب نیە، کافر ئەبێ،بەڵام ئەگەر باوەری بە واجب بونی زەکـات هەبوو، لە بەر قارنانی (بُخْل) زەکاتی نەئەدا،ئەبێ گەورەی موسوڵمانان زەکاتی لێ بستێنی، جا ئەگەر جەنگی کرد، ئەبێ جەنگی لەگەڵ بکرێ. خوای گەورە ئەفەرموێ (فَإِنْ تَابُوا وَأَقَامُوا الصَّلاةَ وَآتَوُا الزكاة فَخَلّوا سَبِيلَهُمْ) ٥ (التوبة) ئەگەر تۆبەیان کردو، نوێژیان کردو، زەکاتیان دا: وازیان لێ بێنن، واتە ئەگەر زەکاتیان نەدا بیان کوژن.

عن ابي هريرة رضي الله عنه؛لَمَّا تُوفِّيَ النبي ﴿ﷺ﴾وَاُسْتُخْلِفَ أَبُو بَكرٍ رضي اللهَ عنه وَامْتَنَعَ الْبَعْضُ مِنَ أداءِ الزَّكَاةِ، قَال: (واللّهِ لَوْ مَنَعُونى عَناقاً كانُوا يُؤَدّونَها اِلَى رَسُوُلِ اللّهِ﴿ﷺ﴾ لَقَاتَلْتُهم عَلىٰ مَنعِه) رواه البخاري ومسلم.لەو کاتەی ئیمامـــــی (ابو بکـر)کرایە جێنیشی پێغەمبەر﴿ﷺ﴾چەند کە سێك گوتیان،ئێمە زەکات نادەین، ئەویش فەرموی،(واللّه) ئەگەر یەك چو شتێرم نەدەنێ کە کاتی خۆی ئەیاندا پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ من جەنگیان لەگەڵ ئەکەم، کەوابوو: ئەگەر چەند ساڵێك زەکاتی نەدابوو ئەبێ بیـدا،(١)(بـزانە) سەرفیترەی مانگی رەمەزان بەشێکە لە زەکات، جا بۆ زانینی چەندو چۆنیەتی زەکات، بروانە کتێبەکانی شەرعی ئیسلامی.

## ٤ـ « باسی رۆژووی رەمەزان »

| | |
|---|---|
| ئەوجا پێویستە لەسەر موسوڵمان | کە بەرۆژوو بێ مانگی رەمەزان |
| رۆژوو لە ئیسلام، وا بریار دراوە | لەکاتی بەیان، هەتا رۆژ ئاوا |
| خواردن حەرامە لەگەڵ خواردنەوە | هەر جۆری هەبێ، هەروا رشاندنەوە |
| لە قسەی پروپوچ لەگەڵ جنێودان | زوبانت بگرە، هەم لە درۆو بوختان |

بە رۆژوو بوونی مانگی رەمەزان روکنی چوارەمی ئیسلامە لە مانگی (شعبان)ی ساڵی (٢)ی کۆچی واجب کراوە، خوای گەورە فەرمویەتی (شَهْرُ رَمَضَانَ الَّذِي أُنْزِلَ فِيهِ الْقُرْآنُ هُدًى لِلنَّاسِ وَبَيِّنَاتٍ مِنَ الْهُدَىٰ وَالْفُرْقَانِ فَمَنْ شَهِدَ مِنْكُمُ الشَّهْرَ فَلْيَصُمْهُ) ١٨٥ (البقـرة) مانگی رەمەزان ئەو مانگەیە کە قورئانی تێدا هاتۆتە خوارەوە، ئەم قورئـانـە رێ روون کەرەوەیـە بۆ خەڵکیو ئایەتەکانی ئاشکرایە لەو ئایەتانەیە کە جیاوازی نێوان چاکە و خراپە ئاشکرا ئەکەن، جا هەر کەسێ گەیشـتە ئەم مانگە:با بەرۆژووبێ

(١) لەمەزهەبی(ابی حنیفە)سەر فیترە(١) کیلۆو(٨١٥)غرام گەنم، یان نرخی ئەم ئەندازەیەیە.



www.iqra.ahlamontada.com

کەوابوو:ـ هەر کەس باوەری بە واجب بوونی رۆژوو نەبێ، کافر ئەبێ.بەلاّم ئەگەر باوەری هەبووکە واجبە» لە بەرتەمبەلیّ بە رۆژوو نەبوو، ئەبێ تامانگی رەمەزان کۆتایی دێ، بیخەنە بەندیخانەو، بە رۆژ خواردن و خواردنەوەی لیّ قەدەغە بکرێ، واتە: دروست نیە بکوژرێ، چونکە هیچ بەلْگەمان نیە (بزانە) هەر کەس رۆژووی لەسەر بوون:ئەبێ قەزایان بکاتەوە، جا ئەگەر هاتو، قەزای نەکردنەوەو، مرد: ئەبێ خزمەکانی، یان بۆی قەزابکەنەوە،یان فیدیەی بۆ بدەن، هەروەك پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ فەرمانی داوە. بروانە (البخاری و مسلم).

## ه. «باسی حەج و عومرە»

لە تەمەن یەك جار ئەی برای دلّسۆز
برۆ بۆ (مكة)ی خاوێن و پیرۆز

ماڵی خوای گەورە وا لە مەککەیە
بۆ موسولْمانان هەر ئەو قیبلەیە

لەوێ حەج بکە هەروەها عومرە
تا لێت ببوری خواوەندی گەورە

لە دوای حەج برۆلە بۆ (مەدینە)
شاری پیرۆزی سەروەری دینە

بکە زیارەتی پێغەمبەری خۆت ﴿ﷺ﴾
تا لەلای خودا شەفاعەت کا، بۆت

(حەج) کردن روکنی پێنجەمی ئیسلامە، لە سالّی (٦) کۆچی واجب کراوە،بەلاّم بەدرێژایی تەمەن یەك جار واجبە. خوای گەورە فەرموێەتی:(وَلِلَّهِ عَلَى النَّاسِ حِجُّ الْبَيْتِ مَنِ اسْتَطَاعَ اِلَيْهِ سَبِيلاً) ٩٧ (آل عمران) خوای گەورە واجبێکی لەسەر خەلّك هەیە، کە حەج کردنی ماڵی خوایە، لەسەر ئەو کەسە واجبە کە توانای رێگای هەبێ.

کەوابوو: هەر کەس باوەری بە واجب بوونی حەج نەبێ، کافرە. بەلاّم هەندێ لە پێشەوایانی ئایینی فەرمویانە:ـ عومرە واجب نیە، سوننەتە.جا ئەگەر کەسێك باوەری بە حەج هەبوو، بەلاّم لەبەر تەمبەلیّ، یان قارنانی حەجی نەکرد: ئەوە لە دونیا سزای بۆ دانەندراوە، جا ئەگەر مرد:دروست نیە میراتەکەی دابەش بکرێ، تا ئەرکی حەج کردنی لیّ دەرئەکرێ. (عن ابن عباس رضي الله عنهما:اَنَّ رَجُلاً قال للنَّبِيِّ ﴿ﷺ﴾:اِنَّ أبِي مَاتَ وَعَلَيْه حَجَّةُ الاِسْلاَمِ أفَأحُجُّ عَنْهُ؟ قال:ـ اَرَأَيْتَ: لَوْ اَنَّ اَبَاكَ تَرَكَ دَيْناً عَلَيْه اَتَقْضِيه عَنْه؟ قال: نعم. قال:ـ فَاحْجُجْ عَنْ أبِيكَ) رواه النسائي. پیاوێك گوتی بە پێغەمبەر﴿ﷺ﴾، باوکم مردوەو حەجی لەسەرە ئایا حەجی لە جیاتی بکەم؟ فەرموی: پێم بلێ، ئایا ئەگەر باوکت قەرزێکی لەسەر بایە، قەرزەکەت بۆ ئەدا وە؟ گوتی: بەلیّ. فەرموی: کەوابوو حەج لە جیاتی باوکت بکە.



www.iqra.ahlamontada.com

## « باسی زیارەتی گۆڕی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ »

زانـایانی ئیسلام جگە لە (ابن تَیْمِیَّه) بە تێکرایی فەرمویانە:ـ زیارەتی گۆڕی پێغـەمبـەر ﴿ﷺ﴾ سوننەتێکی زۆر گەورەیە، چونکە: زۆر لە سەحابەی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ زیارەتیان ئەکرد، هەروەك ئیمام (مالك) و ئیمام (أحمد) گێراویەتیانەوە (وعن ابن عمر رضي الله عنهما:عن النبي ﴿ﷺ﴾: من زار قَبْرِي وَجَبَتْ لهُ شفَاعَتِي) رواه البَيْهقِيُّ، والـدارَ قُطْنِي والقـاضِي عيـاض، وَحَسَنَهُ السُّبْكِيّ، وَصَحَّحَه ابْنُ حَجر الهَيْتَمِي، وضَعَّفَـه الامـام النواوي. رضِيَ الله عنهم اجمعين. هەر کەسێ زیارەتی گۆڕەکەم بکا من لەلای خواشەفاعەتی بۆ ئەکەم تالێی ببورێ.(١)

جا پێش هەموو شتێك، دوو رەکات (تَحِيَّةَ المسْجد) بکە، ئینجا رووبکە لای گۆڕی پیرۆزی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾، پشتت لە قیبلە و، بڵێ (السلام عَلَيْك يارسُولَ الله) ﴿ﷺ﴾ (عن ابي هريرة رضي الله عنه:عن النبي ﴿ﷺ﴾: مامِنْ اَحَدٍ يُسَلِّمُ عَلَيَّ الاَّ رَدَّ اللهُ عَلَىَ رُوحي حتى اَرُدَّ عَلَيـه السَّلام) رواه البَيْهقي وَأبـو داود بسند صالح، هەر کەسێ سەلامم لێ بکـا، خوای گەورە گوفتارەکەم ئەداتەوە، تاوەڵامی سەلامی ئەدەمەوە. ئینجا هەنگاوێك بەرەوراستە بڕۆوسەلام لە ئیمامی (أبو بكر) بکە. ئینجا هەنگاوێکی تر بەرەو راستە بڕۆ و سەلام لە ئیمامی (عمر) بکە چونکە هەردووکیان لەو ژوورەدا نێژراون کە پێغەمبەری ﴿ﷺ﴾ تێدا نێژراوە. بەڵام ئاگادار بە:ـ دروست نیە دارو دیواری گۆڕماچ بکەیو دەستی پێدابێنی.

---

(١) لێرەدا چەند موسوڵمانێك رەخنەیان هەبوو، چونکە (حدیث)ی بێهێز (ضعیف)م هێناوە، ئینجا بۆ وەڵام دانەوە ئەم زانستە ئەخەمە بەرچاو:

لە (علوم الحـديث) دا (قـاعدة)یە: ئەگەر (سند)ی (حدیث) ێك (ضعیف) بوو، بەڵام (متن)ی حەدیسەکە لەگەڵ (متن)ی حەدیسێکی تری (صحیـح) تێکی ئەکـردەوە: ئەم حەدیسـە (صحیـح)ە ئەبێتە (شاهد)ی حەدیسەکەی (ضعیف) و بێهێـزییەکەی لا ئەباو، ئەبێتە (حسن لغیره) و، بەکاردێ وەکو حەدیسی (حسن لذاته)، بۆ وێنە: ئەم حەدیسـەی زیارەتی گۆڕی پـێغەمبەر ﷺ لەلای (نواوی) بە (ضعیف) دانراوە، لەلای (سُبْکی) و (ابن حجر) بە (صحیح) یان بە (حسن لغیره) دانراوە: چونکە پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ: (كُنْتُ نَهَيْتُكُم عَن زِيارةِ القُبُور فَزُورُوها فَاِنَّها تُذَكِّـر الآخـرة) رواه مسلم، لەمـەو پێش زیـارەتی گۆڕەکانم لە ئێوە قەدەغەکردبوو، ئێستا زیارەتیان بکەن چونکە قیامەتتان دێنێتەوە یاد، هەروەها ئەفەرموێ: (شَفَاعَتي لأَهْلِ الكبائِرِ مِنْ أُمَّتي) رواه الترمذي وابو داود، شەفاعەتی من لە رۆژی قیـامـەت: بۆ تاوانبـارە گەورەکـانە لە ئوممەتی خۆم، کەواتە (متن)ی ئەم دوو حەدیسەو، (متن) ی حەدیسەکەی زیارەتی گۆڕی پێغەمبەر ﷺ تێکیان کردەوە، واتە زیارەتی گۆڕی گشت موسوڵمانێك خێرە، بەڵام هی گۆڕی پێغـەمبـەر ﷺ خێرترە، هەموو گوناهبارێکی موسوڵمان شەفاعەتی بۆ ئەکرێ، بەڵام ئەوەی زیارەتی گۆڕی پێغەمبەری ﷺ کردبێ: شەفاعەتێکی تایبەتی بۆ ئەکا، کەوابوو: (متن) ئەم دوو حەدیسە لەناو (متن)ی حەدیسەکەی تردا کۆکراوەتەوە، ئەم جۆرە حەدیسانەش لە کتێبەکانی ئایینی دا جگە لە (بخاری) و (مسلم) زۆرن و، بەکاردێن، ئینجا ئەوەش بزانە: ئیمام (احمد) ئەفەرموێ: حەدیسی (ضعیف) بەکاردێ بەو مەرجەی دژایەتی نەبێ، واتە: لەگەڵ (قران) و (حدیث)ی (صحیح)، جا تکایە لەم زانستانە ئاگاداربە ئینجا رەخنە بگرە. دانەر.

www.iqra.ahlamontada.com

(پاشکۆ) بزانە: لە (شرح جوهرة التوحید) دا ئەفەرموێ:ـ منالەکانی موسولمانان بە ئیماندار دائەندرێن لە دونیادا، هەر چەند شادەش نەهێنن بە درێژایی تەمەنیان، بەلام: هەر کەسێك داوای شادە هێنانی لێ بکرێو، بەهۆی رقەکاری شادەنەهێنێ: ئەوە بەکافردا ئەندرێ لە دونیاو، قیامەت.

جا ئەگونجێ ئەمەیان مەبەستی ئیمامی (نواوی) بێ، کە لە (شرح مسلم) دا ئەفەرموێ: زانایان یەکدەنگن: کە هەر کەسێك بەزوبان شادەنەهێنێ: ئەوە بە یەکجاری لە دۆزەخ دا ئەمێنێتەوە. کەوا بوو: هەر کەسێك نەژادی بگاتە باوکێکی موسولمان، یان دایکێکی موسولمان، یان شادەی هێنا، وهاوبەشی بۆ خوا دانەناو، نە بەزوبان و، نەبەکردەوە کوفری نەکرد: ئەوە موسولمانەو، بەگو ناهەکانی تر کافر نابێ، هەر چەند چوار روکنەکانی تری ئیسلامیش جێ بەجێ نەکا، بەومەرجەی گوناهەکە بە حەلال دانەنێ، کەوابوو: ئەم جۆرە گوناهبارە بە موسولمانێکی (فاسق) ناو ئەبرێ.

(عَنْ اَنَس رَضِي الله عنه: قال النبي ﷺ: مِنْ اَصْلِ الأيمان اَلكَفُّ عَمَّنْ قال: لا اِلٰهَ اِلاّ الله، وَلاَ نُكفِّرُهُ بِذَنْب، وَلاَ نُخْرِجُهُ مِنَ اْلأسْلام بِعَمَلٍ) رواه ابو داود.

واتە: یەکێك لە بناغەی ئیمان وازهێنانە لەو کەسەی شادەی هێناوە، بە هیچ گوناهێك کافری نەکەین و، بە هیچ کردەوەیەك لە جوغزی ئیسلام دەری نەکەین.

جا ئەگەر هاتو ئەم گوناهبارە تۆبەی نەکردو، بە ئیمانەوە مرد؛ ئەوە بریاردان لە دەست خودایە، ئەگەر حەزبکا سزای ئەدا، وە ئەگەر حەز بکا لێی خۆش ئەبێ هەر وەك فەرمویەتی (إِنَّ اللهَ لاَيَغْفِرُ اَنْ يُشْرَكَ بِهِ وَيَغْفِرُ مادُونَ ذٰلِكَ لِمَنْ يَشاءُ) ٤٨ (النساء) خوای گەورە لەوە خۆش نابێ کە هاوبەشی بۆ دابندرێ‌ولە گوناهەکانی بەرەوخوارتر خۆشــ ئەبێ، لەو کەسە خۆش ئەبێ کە خۆی حەز بکا. (ئاگاداری) هەر گوناهێك ببێتە نیشانەی کەم بایەخی بە ئایین، جا لە دونیا سزای بۆ دا نرابێ، یان هەرەشەی قیامەتی لەسەر هاتبێ، یان لەعنەت، یان غەزەبی خوا،ئەمانەگشتی‌گوناهی گەورەنە جگەلە مانەش گوناهی بچوکن.

ئینجا بزانە: هەموو گوناهێك بە تۆبە کردن لائەچێ وخوالێی خۆش ئەبێ ئەگەر مەرجەکانی تۆبە بێتە جێ، خوای گەورە فەرمویەتی (وَاِنِّی لَغَفّارٌ لِمَنْ تابَ وَآمَنَ وَعَمِلَ صالِحاً ثُمَّ اَهْتَدیٰ) ٨٢ (طه) واتە؛بێگومان من زۆر لەو کەسە خۆش ئەبم کە تۆبە ئەکاو، باوەردێنیو، کردەوەی چاك ئەکاو ئینجا لەسەر رێگەی راست ئەمێنێتەوە.

هەروەها گوناهی بچوك کە پەیوەندی بە ئادەمیزادەوە نەبێ: بە چاکە کردنیش لائەچێ، خوای گەورە فەرمویەتی (اِنَّ الْحَسَناتِ یُذْهِبْنَ السَّیِّئاتِ)١١٥ (هود) بێگومان



www.iqra.ahlamontada.com

چاکـەکان خراپەکان لائەبەن، جا بزانە: ئەو خراپانەی پەیوەندی بە ئادەمیزادەوە هەیە، مەرجە: ئەبێ خاوەن مافەکەرازی بکرێ، هەروەك لە (تۆڵەی ڕۆژی دوایی‌دا) باسی ئەکەین.

هەروەها مەرجە: بۆ قبوڵ بوونی تۆبەی (کافر) ئەبێ شادە بێنیو، لە کوفرەکەی پەشیمان بێتەوە، خوای گەورە فەرمویەتی (قُلْ لِلَّذِينَ كَفَرُوا اِنْ يَنْتَهُوا يُغْفَرْ لَهُم مَاقَدْ سَلَفَ) ٣٨ (الانفال) بەکافرەکان بڵێ:ـ ئەگەر واز لە کوفر بێنن و موسوڵمان ببن، لە ڕابوردویان خۆش ئەبێ.

هەروەها بە بەڵاو، موسیبەتی دونیاش گوناه لائەچن (عَن ابي هريرة رضي الله عنه عن الـنبي ﴿ﷺ﴾. مَايُصيبُ الْمُسْلِمِ مِنْ نصَبٍ، وَلاوَصَبٍ، وَلاهَمٍّ وَلاَ حَزَنٍ، وَلاغَمٍّ، حَتَى الشـوْكَةُ يُشاكُهَا اِلاَّ كفَّر الله بهاَ مِنْ خطاَياَهُ) رواه البخاري ومسلم. هەرچی تووشی موسـوڵمان ئەبێ، لە ماندوویی‌و،نەخۆشی‌و،دەردو، غەم و،خەفەت و، ئازارو، دڵتـەنگی، تا درکێکیش بچـەقێتـە لاشـەی؛ بە هۆی ئەوانە خوای گەورە ...اهەکانی دا ئە پۆشی.

## « باسی ڕوکنی ئیمان »

**ئیمان پێك هاتووە لەم شەش بەشانە ● باوەڕ بە خوداو، مەلایکەتانە لەگەڵ کتێبی خواو، هەموو پێغەمبەر ● ڕۆژی دوایی، هەم قەزاو قەدەر هەر کەس بەوشەشە باوەڕی نەبێ ● یان بە یەکێکیان: ئەو کافر ئـەبـێ**

ئیمـان باوەڕی ناودڵە بەوشـەش ڕوکنـانـەی باسیـان ئەکـەین، بەو مەرجەی بەزوبانیش هەردوو وشەی شادە بڵێ (عن عمر رضي الله عنه عن النبي ﴿ﷺ﴾ قَالَ: اَلأيمانَ اَنْ تؤمِنَ بالله وَمَلائِكتِهِ وكُتُبِهِ وَرُسُلِهِ وَالْيَوْمِ الْأخِرِ وَتؤمِنَ بالقَدَرِ خيْرِهِ وَشَرِّهِ) رواه البخـاري و مسلم، واللفـظ لَهُ، واتـە: ئیمـان ئەوەیە باوەڕت هەبێ بە خواو، مەلائیکەی خواو، کتێبەکانی خواو، پێغەمبەرانی خواو، ڕۆژی دوایی‌و، قەزاو قەدەر. جالەم شەش ڕوکنـانـە پێنجیـان بەیـەکەوە لەم ئایاتە پیرۆزەدا گوتراو ن کە خوا ئەفەرموێ (وَلَكِنِّ الْبِرَّ مَنْ آمَنَ باللهِ، وَالْيَوْمِ الآخِرِ، وَالْمَلائكَةِ وَالكِتَابِ وَالنَّبيِّينَ) ١٧٧ (البقـرة) وە ڕوکنی شـەشـەم لەم ئایە تەدا گوتراوە (إِنَّا كُلَّ شَيْءٍ خَلَقْنَاهُ بِقَدَرٍ) ٤٩ (القمر) کەوابوو؛ هەر کەسێك باوەڕی بەڕوکنێك لەم ڕوکنانە نەبێ کافرە.



www.iqra.ahlamontada.com

## « ئاگاداری »

ئیمان بەکردەوەی چاك زیاد ئەبیّو، بەکردەوەی خراپ دا ئە بەزی، خوای گەورە فەرمویەتی (وَاِذا تُلِيَتْ عَلَيهِم آياتُهُ زادَتْهُمْ اِيمانًا) (٢) (الانفال) کاتیّ ئایەتەکانی خوایان بەسەردا ئەخویّندریّ، ئیمانیان زیاد ئەکا.

کەوابوو: ـ کردەوەی چاك نیشانەی ئیمانی تەواوە، هەروەك پیّغەمبەر ﴿ﷺ﴾ فەرمویەتی: (لَيْسَ الْاِيمانُ بالتَمَنّي وَلا بالتَحَلّي وَلَكِنْ هُوَ ماوَقَرَ فِي الْقَلْبِ وَصَدّقَهُ الْعَمَلُ) رواه ابن النجار والدَّيْلَمِي عن انس رض الله عنه. واتە: ئیمان بە خۆرگەیی نیەو، بەجوان کردنی گفتوگۆش نیە، بەڵکو ئیمان ئەوەیە لە ناودڵ دا جیّگیر بیّو، کردەوەی چاکیش نیشانەی ڕاست کردنی بیّ وببیّتە هۆی باوەڕ پیّکردن.

## ١ـ « باوەڕ بەخودا »

یەك خودا هەیە ناوی (الله)یە ● خاوەنی هیّزە هەروا توانایە
هیچ کاتیّك ناتویّ، بۆ ڕزانی نیە ● بیّ دایك و باوکەو منالّی نیە
هەر ئەو زیندووەو هەرگیز نامریّ ● دەبیسیّو، دەبینیّ هەرچی بکریّ
هەرچی ڕوو بدا، هەرچی ڕوویدا بیّ ● گشتی دەزانیّ لیّی تیّکەڵ نابیّ
خاوەن گوفتارە بەس دەنگی نیە ● هەرچی بیەویّ بەر پیّچی نیە
دروستی کردوین، تا بیپەرستین ● ئەبیّ بیناسین لیّ شی بترسین

ڕوکنی یەکەمی ئیمان ئەوەیە: باوەڕت هەبیّ بە هەبوونی خوا، واتە: ئەم بوونەوەرە دروستکەرێکی هەیە ناوی (الله)یە، هەر ئەو (الله)یەش پەروەردگاری ئەم بوونەوەرەیە، هەر ئەو (الله)یەش خوایەتی ئەم بوونەوەرە ئەکا، کەوابوو: ئەبیّ باوەڕیشمان هەبیّ بەتاك و تەنیایی خوا، لە زات و سیفەت و لە (رُبُوبِيَّة) واتە: پەروەردگاریو، لە (اُلُوهِيَّة) واتە: خوایەتیدا (یەکەم) تاك و تەنیایی لەزات و سیفەت واتە: زاتێکی بە تەنهایەو، هیچ خوای تری لەگەڵ دا نیەو، وەکو هیچ شتێك نیەو، هیچ شتێك وەکو وی نیە ﴿قُلْ هُوَ اللهُ اَحَدٌ﴾ ١ (الاخلاص) بڵێ: ئەم خودایە تاك و تەنیایە ﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيءٌ﴾ ١١ (الشوری) هیچ شتێك وێنەی خوانیە.

هەروەها لە سیفەتەکانیشدا، تاك و تەنیایەو، هاوبەشی‌نیە ﴿هُوَ اللهُ الْواحِدُ الْقَهّارُ﴾ ٤ (الزمر) ئەو خوایە یەکە، دووەمی نیە لە هیچ سیفەتێکداو، زاڵە بەسەر هەموشتێکدا.



www.iqra.ahlamontada.com

(دووەم) تاك و تەنیـایی خوا لە پەروەردگاری (رُبُوبيّة) دا. واتە: تەنها خوای گەورە ئەم بوونەوەرەی دروست كردوەو، بە تەنها بەرێوەی ئەباو بە تەنها ئەم خەڵكە ئەژیێنیو ئەیمرێنی.

(سێـیـەم) تاك و تەنیـایی خوا لە خوایـەتی (أُلُوهِيَّة) دا، واتە: هەر ئەو خوایە پەرستراوە (مَعْبُودٌ) و، هەر ئەو خوایە دادوەرە (حَاكِمٌ) هیچ كەسی تر مافی پەرستن (عِبـادَة) و، دادرەوایی (حَاكِمِيَّة)ی نیە، خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿وَلاَ يُشْرِكُ فِي حُكْمِـهِ احداً﴾ ٢٧ (الكهف) خوای گەورە هیچ كەسێك ناكاتە هاوبەش لە بریارو دادرەوایی خۆی. ئینجـا بزانــە: ئەم سێـیـەمە زۆر گرنگە چونكە زۆر كەس لێرەدا رائەزەلێو، ئەكەوێتە نێو گروهی شەیتان.

## «حەوت سیفەتەكانی «أزلی» (١)

١ـ (اَلْحَيَاة) زیندویی ﴿اَللّٰهُ لاَ اِلٰهَ اِلاَّ هُوَ اَلْحَيُّ اَلْقَيُّومُ﴾ ٢٥٥ (البقره) جگە لە (الله) هیچ خوایەكی ترنیەو، هەردەم زیندووەو نامرێو، هەڵسورێنەری ئەم خەڵكەیە.

٢ـ (اَلْقُدْرَة) توانین﴿اِنَّ اللهَ عَلٰى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾ ٢٠ (البقرة) بێگومان خوا توانای كردنی هەموو شتێكی هەیە.

٣ـ (اَلْإِرادَة) ویستن ﴿فَعَّالٌ لِمَا يُرِيدُ﴾ ١٦ (البروج) چی بیەوێ ئەیكا

٤ـ (اَلْعِلْمُ) زانین ﴿وَهُوَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ﴾ ٢٩ (البقرة) خوا زانایە بە هەمووشتێك

٥ و ٦ ـ ﴿اَلسَّمْعُ وَالْبَصَرُ﴾ بیستن و دیتن ﴿اِنَّ اللهَ هُوَ الْسَّمِيعُ الْبَصِيرُ﴾ ٢٠ (الغافر) خوا بیسەروبینەرە.

---

(١) خوای گەورە ئەفـەرموێ: (وَلِلّٰهِ اَلْأَسْمَاءُ الْحُسْنَىٰ فَادْعُوهُ بِهَا) واتە: ناوە جوان و پیرۆزەكان بۆ خوایە، بەم ناوە پیرۆزانە ناوی خوا بێنن، ئینجا بزانە: ناوە پیرۆزەكانی خوا ـ كە لە (قرآن) و (حدیث) وەرگیراون ـ زۆرن، واتە: تەنها ئەو نەوەدو نۆ ناوەنین كە لە حەدیسی (ترمذی) دا گوتراون، بەڵام لەبەر گرنگی تەنها حەوت سیفەتەكانی (ازلی) م نوسی لەگەڵ ئەوەشدا (معتزلة) دانیان پێداناهێنن، دووبارە بزانە: سەرجەمی ناوە پیرۆزەكانی خوا سێ جۆرن:

یەكەم: (اسم الذات) واتە: ناوی زاتی خوا، كە (الله)یە

دووەم: (أسماء الصِفات) = (صِفاتُ الذات) واتە:

ئـــــەو جـــــــۆرە سیفەتانەی بەزاتی خواوە وەستاون و، لێی جودانابنەوە، چونكە ناگونجێ دژی ئەم سیفەتانە بۆ خوا بەكاربێن، وەكو حەوت سیفەتەكانی (ازلی)، كە سەرجەمی بوونەوەر ئەگرنەوە، دژی ئەم حەوتە ـ كە مردن و، نەزانین و، كەریو... هتد ـ ناگونجێ بۆ خوا بەكاربێن، چونكە ناتەواوی لە زاتی خوا رووئەدا.

سێیەم: )أسماء الافعال( = (صِفات الأفعال) واتە: ئەو جۆرە سیفەتانەی كرداری خوای گەورەن و، بەزاتی خواوە نەوەستاون و، لێی جودا ئەبنەوە، وەكو (رَزاق) و (المُحْيِي) و (المُمِيت) ..هتد دژی ئەم جۆرە ـ كە رزق نەدانی كەسێكەو ژیـانـدن، یان نەمراندندنی كەسێكی ترە ـ دروستە بۆ خوا بەكاربێ، چونكە ئەم جۆرە سیفەتانە لە ژێر (قدرة) و (ارادة)ی خودایەو، ناتەواوی لە زاتی خواروونادا. دانەر .



www.iqra.ahlamontada.com

٧ـ (الكَلام) گفتوگۆی بێ پیت و بێ دەنگ ﴿وَكَلَّمَ اللهُ مُوسىٰ تَكْلِيماً﴾ ١٦٤ (النساء) خوا قسەی لەگەڵ موسی پێغەمبەرکرد ﷺ بزانە: (قورئان) فەرمودەی خوایە. هەروەها ئەو خوایــە هەر هەبووە و نەبوونی نەبووە، هەر ئەمینێ و کۆتایی نایێ ﴿هُوَ الْأَوَّلُ وَالْآخِرُ﴾ ٣ (الحديد).ئەم سیفەتانە بەردەوام سیفەتی خوای گەورەنەو، لەهیچ سیفەتێکا هاوبەشی نیە، هەروەك لە کرداره‌کانی دا هاوبەشی نیە.

## جۆرەکانی «کفر»

(بزانە) دەربارەی باوەڕ بە هەبوونی خوا، وە بەخوایەتی خوا، وەبە تاك و تەنیایی خوا، کافرەکان چوار جۆرن.

یەکەم: کوفری (اِنکار) ٠ واتە: باوەڕ نەبوون بە هەبوونی خوای گەورە،وەکو کوفری (فرعون) خوای گەورە فەرمویەتی ﴿وَقالَ فِرْعَوْنُ يا أَيُّها الْمَلَأُ ما عَلِمْتُ لَكُمْ مِنْ اِلٰهٍ غَيْرِي﴾ ٣٨ (القصص) واتــە: فیرعەون گوتی: ئەی خەڵکینە نەمزانیوە: ئێوە هیچ خوایــەکتــان هەبێ جگە لەمن. کەوابوو: کوفری (مارکسیەت) لەم جۆرەیە، کە لە سەردەمی ئێستادا بڵاوبووەتەوە. بەڵام:

بەڕێز (أبو الأعلى المودودی) وای روون کردۆتەوە کە (فرعون) باوەڕی بە هەبوونی خوا هەبوو، بەڵام دانی پیانەهێناوە، بۆیێ کافر بوو. ئایەتەکەش وا ئەگەیەنێ.

دووەم: کوفری (إباء) واتە: ڕەقەکاریو، دان نەهێنان بە خوایەتی خوا، هەرچەند باوەڕیشی بە هەبوونی خواو، بە پەروەردگاریەتی خوا هەبێ، وەکو کوفری (شەیتان) خوای گەورە فەرموویەتی ﴿وَاِذْ قُلْنا لِلْمَلائِكَةِ اسْجُدُوا لِآدَمَ فَسَجَدُوا اِلَّا اِبْلِيسَ أَبىٰ وَاسْتَكْبَرَ وَ كانَ مِنَ الكافِرِين﴾ ٣٤ (البقرة)

ئەو کاتەی بەمەلائیکەتانمان گوت: سوجدە بۆ ئادەم ببەن، سوجدەیان برد، تەنها شەیتان سوجدەی نەبردو، دانی نەهێنا بە دادڕەوایی خواو، خۆی بە زل زانیو، بووە یەکێك لە کافرەکان.

جا بزانە: بەڵگە لەسەر باوەڕی شەیتان بە هەبوونی خواو، بە پەروەردگاریەتی خوا، ئەم ئایەتەیە ﴿خَلَقْتَنِى مِنْ نارٍ وَخَلَقْتَهُ مِنْ طِينٍ﴾ ١٢ (الاعراف) واتە: خوایە تۆ منت لە ئاگر دروست کردوەو ، ئا دەمیشت لە قوڕ دروست کردوە. کەوابــوو: شەیتان لەبەر ئەوە کافرە، چونکە دانینە هێنا بە دادڕەوایی ـ فەرمانڕەوایی خوای گەورەو، ڕەخنەی لە یاسای خوا گرت. (جا بزانە) کوفری (دیمقراطية) و (إشتراكية) و (مــاسۆنیة) گشتیان وەکو کوفری شەیتانە؟ چونکە ئەزانن خوا هەیە، بەڵام دان ناهێنن بە دادپــەروەریو دادرەوایی خوای گەورەو، یاسایەکەی بە ڕاست نازانن.

www.iqra.ahlamontada.com

(عن عديّ ابن حاتم رضي الله عنه قال: أتيت النبي ﴿ﷺ﴾ وسمعته يقرأ ﴿إتخذوا أَحْبارَهُمْ وَرُهْبانَهُمْ أَرْباباً مِنْ دوُنِ اللّهِ﴾ ٣١ (التوبة) قال: أَمَا أَنَّهُمْ لَمْ يَعْبُدُوهُمْ وَلكِنَهُمْ كانوا إِذا أَحلوا لَهُمْ شَيْئاً اِسْتَحَلُّوه وَإِذا حَرَّمُوا عَلَيْهِمْ شَيْئاً حَرَّمُوهُ﴾

رواه أحمد والترمذي، واتـــــــــه. عەدي ئەڵێ: چومە لای پێغەمبەر ﷺ گوێم لێ بوو، ئەم ئایەتەی ئەخوێندەوە، کە خوائەفەرموێ:ـ جووەکان و دیانەکان جگە لە خودا، مالەکانی خۆیان و قەشەکانی خۆیان = (زانا ئایینیەکانیان) کردونە تەخودا، ئینجا پێغـەمبـەر ﷺ فەرمـوی: خۆ ئەوان نەیـانپەرستون، بەڵام شوێن یاســا دەستکردی ئەوان کەوتوون، ئەگەر شتێکیان بۆ حەلال بکەن بە حەلالی ئەزانن وە ئەگەر لێ یان حەرام بکەن بەحەرامی ئەزانن. کەوابوو: ئەم ئایەت وحەدیسە ئامۆژگاریو هەرەشـــەیـە بۆ موسوڵمانان،تاکو لە خوا بترسێن و، وەکو جولەکەو دیانەکان شوێن یاسای دەستکرد نەکەون، چونکە جگە لە خوا، کەسی تر مافی حەرام کردن و حەلال کردنی نیە. (١).

(سێیەم): کوفری (إشْراك) واتە: هاوبەش دانان بۆ خوا، لە دادرەوایی‌دا، یان لە پەرستن دا، یان لە یەکێك لە سیفەتەکانی‌دا، جا هەر کەسێ هاوبەش بۆ خوا دابنێ: کافـرە، هەر چەنـد باوەڕیشی بە هەبوونی خواو، پەروەردگاریەتی خوا هەبێ،وەکو

---

(١) بەداخـەوە: زۆر لە موسـوڵـمانان ـ بە تایبەتی ئەوانەی خۆ بە زانا دائەنێن ـ بانگەوازی بۆ (دیمقراطية) ئەکەن و، پشتگیریشی لێ ئەکەن و، ئەڵێن:(دیمقراطية) دژ بە ئیـسلام نیەو، ئیـسلام بە خۆی (دیمقراطي)یە، لە کاتێکدا ئەزانن: کە (شەیتان) بوێی (لعْنة)ی لێکرا چونکە رەخنەی لە یاسای خوا گرت‌و گوتی:

﴿ااَسْجُدُ لِمَنْ خَلَقْتَ طيناً﴾ الاسراء (٦١) چۆن سوجدە بۆ کەسێك (ئادەم) بەم کە لە قوڕ دروستت کردووە؟ ئینجا بەم رەخنەیە خوای گەورەی بە لێنە زان و بەهەڵەدا چو دا ناو، گوتی:﴿اَنَاْ خَيْرٌ مِنْهُ﴾ الاعراف (١٢) من لە ئادەم باشترم. ئینجا سیستەمی (دیمقراطي)ش وەکو (شەیتان) رەخنە لە یاسای خوا ئەگرێ و، ئەڵێ: چۆن دەستی دز ببڕیو؟ زیناکەردار کاری بکرێو؟ ڕێگر لە سێدارە بدرێ؟ . . هتد، وە خوای گەورە بەلێنەزان وبەهەڵەدا چودائەنێ‌و، ئەڵێ: پێویـستە گەل بەخـۆی نوێنـەری خۆی هەڵبژێریو، تاکو لە (برلمان) یاسای دەستکردیان بۆ دابنێن هەر چەند بە پێچەوانەی یاسای خوداش بێ، جا ئەم (برلمانی) یانەش بەوشـەی سـەرقۆزو بن ئالۆز لە ژێر دروشـمی مافی مرۆڤ و، مـــــافی چارەنووسی گەل‌ومافی ئافرەت‌و،ئەم خەڵکەیان بەنج کردوەو، پێیان ئەڵێن: ئیسلامەتی کۆنەپەرستی‌یەو، یاسای ئیسلام ستەمکارو، ناتەواوو، دژ بە نەتەوایەتی‌یە، کەوابوو: ئێمەی رۆشنبیر یاسایەکی باشتر لە یاسای ئیسلامتان بۆ دائەنێن و، لەم کۆنە پەرستی‌یە ڕزگارتان ئەکەین.

جا ئێمەی موسڵمان لێیان ئەپرسین: ﴿أَأَنتُمْ أَعْلم أم اللّه﴾ البقرة (١٤٠) ئایا ئێوە باشتر ئەزانن یان خودا؟ ئێوە بە بەزەیی ترن یان خوا؟ ئینجا نابێ لێیان بترسێن و، پێیان ئەڵێین ﴿فَلاتَضْرِبُوا لِلّهِ الأمثالَ اِنَّ اللّهَ يَعْلَمُ وَاَنْتُمْ لا تَعْلَمُوْنَ﴾ النحل (٧٤) هاو وێنە بۆ خودا مەنێن، چونکە خوا ئەزانێ‌و ئێوە نازانن، کەوابوو: ئێمەش شوێن ئەو یاسایە ئەکەوین: کە لەلای خوای گەورە (جبـرائیل)ی ئەمین بۆ پێغەمبەری ئەمینی ﷺ هێناوەو، شوێن ئەو یاسایە ناکەوین: کە ئێوەی نوێژ نەکەرو، شەرابخۆر دائەنێن، ئێمە ئەبینە بەندەی خوای گەورەو، نابینە بەندەی ئێوەی نەفام. دانەر .



www.iqra.ahlamontada.com

(قورەیشی)یەکانی (مەککە)؟ چونکە هاوبەشیان بۆ خوا دانا بوو؛ خوای گەورە بە کافری دانان و، پێغەمبەر صلیٰ الله علیه وسلم جەنگی لەگەڵ کردن.

﴿عن ابن عباس رضي الله عنهما قال: مَرِضَ ابو طالب، فجائَتْهُ قُرَيْشٌ وَشَكَوْا النَّبيَّ ﴿ﷺ﴾ فَقالَ أبو طالب: يا ابْنَ أخي ما تُريدُ مِنْ قَوْمِكَ؟ فَقالَ: أُريدُ مِنْهُمْ كَلِمَةً واحِدَةً يا عَمّ، يَقُولُوا: لاالَهَ الاّ اللّهفَقالوُا: الِهاً واحِداً؟ ما سَمِعْنا بِهٰذا في الْمِلَّة الأخِرة اِنْ هٰذا الاّ اخْتِلاٰقُ، فَنَزَلَ فيهِمْ سُورَةُ ﴿صٓ﴾ اِلىٰ قَوْلِهِ: اِنَّ هٰذا اِلاّ اُخْتِلاقٌ﴾ رواه الترمذي. (قورەیشی)یەکان هاتنە لای (ئەبو تالیب)ی مامی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ شکایەتیان لە پێغەمبەر کرد، جا (ئەبو تالیب) گوتی: برازاکەم تۆ چیت لە گەلەکەی خۆت ئەوێ؟ پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ فەرموی: تەنها یەك و شەم لێیان ئەوێ، ئەی مامە، با بڵێن: (لاٰ اِلهَ اِلاّ اللّه) جگە لە (اللّه) هیچ خوایەکی تر نیە، کە دادوەربێ‌و، بپەرسترێ.جا قورەیشی‌یەکان گوتیان: یەك خوا بە تەنها دادوەرو، پەرستراو بێ؟ ئەوەمان نەبیستوە لە ئاییـنی (عیسا پێغەمبەر) ﴿ﷺ﴾. ئەمە دانانی خۆتە، چۆن یەك خوا ئەتوانی کاروباری ئەم خەڵکە بەڕێوەببا، ئینجا دەربارەی ئەم ڕوداوە سورەتی (ص) هاتە خوارەوە تا (الاّ اختلاف)

بەڵگە لەسەر باوەری (قورەیشی)یەکان بە هەبوونی خواو، بە پەروەردگاریەتی خوا، ئەم ئایـاتەیە ﴿وَلَئِنْ سأَلْتَهُمْ مَنْ خَلَقَ السَّمٰواتِ وَالْاَرْضَ لَيَقُولُنَّ الله﴾ ٢٥ (لقمان) ئەگەر لێیان بپرسی کێ ئاسمان و، زەمینی دروست کردوە؟ لەوەڵاما ئەڵێن: خوا دروستی کردون.

هەروەها بەڵگە لە سەر خوا پەرستی (قورەیشی)یەکان بە هاوبەش، ئەم ئایەتەیە ﴿ما نَعبُدُهُم الاّ ليُقرّبونا الىٰ الله زُلْفىٰ﴾ ٣ (الزمر) ئێمە لەبەر هیچ هۆیەك ئەم بتانە ناپەرستین، تەنها بۆ ئەوە نەبێ تا لە خوامان نزیك بکەنەوە.جا بزانە:هەر کەسێ وا تێبگا، کە جگە لە خودا شتێکی تری کاریگەر هەیەو کار ئەکاتە سەر جموجۆڵی ئەم بونەوەرە، یان نەخۆش چاك ئەکاتەوە، یان شایانی پەرستنەو، نەزرو، ڕۆژووی بۆ بکا ئەمەش وەکو قورەیشی‌یەکان کافرە.

ئینجا بزانە: ئەو مرۆڤە (علمانی) یانەی ئەڵێن: یاسای ئیسلام هەمە لایەن نیەو، بە تەنها چارەسەری ئەم خەڵکە ناکاو، پێویستە یاسای دەستکردیشی لە گەڵدا بێ: کوفری ئەوانەش وەکو کوفری (قورەیشی)یەکانە، چونکە خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿اِنِ الْحُكْمُ اِلاّلِلّه اَمَرَ اَلاّ تَعْبُدُوا اِلاّ اِياهُ ذٰلِكَ الدّينُ الْقَيِّمُ﴾ ٤٠ یوسف.دادوەرایی (حـاكِمِيَّـة) تەنها مافی خوایە فەرمانی داوە: جگە لەوی کەسی تر نەپەرستن و، بە دادوەر (حاکِم)ی دانەنێن.ئەوە ئاییـنی ڕاستەقینەیە.



www.iqra.ahlamontada.com

(چوارەم) کوفری (نِفاق) دووڕوویی، واتە: مرۆڤی (مُنافِقْ) بەزوبان شادە بێنیو، بڵێ: موسوڵمانم و، باوەرم هەیە، (بەڵام لە راستیدا بە دڵ باوەری نەبێ، جا ئەم جۆرە کوفرە بە زۆری لەو کەسانە روو ئەدا کە لەخانەی ئیسلام دا نیشتەجێن، تاکو بتوانن لەگەڵ موسوڵمانان ژیان بەرنەسەر، خوای گەورە ئەفەرموێ (وَمِنَ النَّاسِ مَنْ يَقُولُ آمَنَّا بِاللَّهِ وَبِالْيَوْمِ الْآخِرِ وَمَاهُمْ بِمُؤْمِنِينَ يُخادِعُونَ اللَّهَ والذينَ آمنوُا) ٨ـ البقرة، هەندێ کەس هەنە ئەڵێن: باوەرمان بە خواو بە رۆژی ـوایەهەیە|بەڵام لە راستیدا بباوەردارنین، فێڵ لە خواو موسڵمانان ئەکەن.

## « ئاگاداری »

یاسـای ئیسلام لە قورئان و حەدیسی پێغەمبەر ﷺوەرگیراوە، هەروەك لە باسی قورئان روونی ئەکەینەوەجا هەر کەسێك بەم یاسایە رەفتار بکا: دیارە خوای گەورەی بە دادوەر (حـاکم) ناسیوە. بەڵام ئەگەر باوەری بە یەکێك لە روکنەکانی ئیمان و ئیسلام نەبوو، یان گاڵتەی بەروکنێك لەم روکنانەکرد، یان بەزوبان، یان بە کردەوە (کُفْر)ێکی کرد: ئەوە بە (کافر) دا ئەندرێ هەروەك باسمان کرد.

## «٢» باسی باوەر بە فریشتەی خوا «ملائکة»

باوەرت هەبێ، برای موسڵمان
بە فریشتەی خوا لە ئەرزو ئاسمان

بێ خەو و خواردن، نەنێرن نەمێن
لە خوا پەرستی هیچ کات ناحەسێن

یەکیان (جبرائیل) بۆ وەحی هێنان
هەروا (میکائیل) بۆرزق و باران

بەوەی روح کێشە ئەڵێن (عزرائیل)
بۆ دونیا تێك دان بڵێ (إسرافیل)

(منکر) و (نکیر) لە ناو گۆری تار.
دوو لە راستەو چەپ، ئەنوسن کردار

جگە لەوانەش فریشتە زۆرن
هەر خوا ئەزانێ ئەوان چەند جۆرن

(عن عائشه رض الله عنها: قال النبی ﷺ: خُلِقَتِ الْمَلائِكَةُ مِنْ نورٍ) رواه مسلم، واتە: فریشتە لە روناکی دروست کراون، ئینجا بزانە: فریشتە توانیان هەیە خۆیان بێننە سەر هەموو وێنەیەکی جـوان، توانای هەموو کارێکیان هەیە، نەنێرن نەمێن، خەوو، خواردنیـان نیـە، کاروبـاری ئەم بوونەوەرە هەڵـئەسورێنن، خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿فَالْمُدَبِّراتِ اَمْراً﴾ە (النازعات) سوێند بەو فریشتانەی کاروبار بەرێوە ئەبەن، جا هەرچی بیکەن بە فەرمانی خوایە و، لە فەرمانی خوا دەرناچن ﴿لا يَعْصُوُنَ الله ما اَمَرَهُمْ وَيَفْعَلوُنَ ما يُؤمَروُنَ﴾ ٦ (التحريم) ئینجا بزانە: گەورەی فریشتەکان سێنە.



www.iqra.ahlamontada.com

یەکەم:- (جُبْرائِیل) وەحی بۆ پێغەمبەران دێنی (دووەم) میکائیل) دابەش کردنی رزق و بارانی لە دەستە ﴿عن ابن عباس رضي الله عنهما أنّ اليهودَ سألوا النبيَّ ﴿ﷺ﴾ مَن صاحِبُكَ؟ قال: جبريلُ، قالوا جبريل؟ ذاكَ ينزِلُ بالحرب والعذاب عدوّنا، لو ... ميكائيل الذي ينزل بالرحمة والنبات والقطر لكان خيراً فنزلت: قُلْ مَنْ كانَ عَدُوّاً لِجِبْرِيلَ فَإنَّهُ نَزَّلَهُ عَلَىٰ قَلْبِكَ بِإذْنِ اللهِ﴾(البقرة) رواه احمد والترمذي. جولەکە پرسیاریان لە پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ کرد. ئایا:

کێ (وەحی) بۆ تۆ دێنی؟ فەرموی: جوبرائیل، گوتیان: جوبرائیل دوژمنی ئێمەیە چونکە جەنگ و ئازار دێنێتە خوار، ئەگەر گوتباتە. میکائیل بۆم دێنی، ئەوە باش بوو، چونکە ئەمە خێروخۆشی و باران دێنێتە خوار، ئینجا ئایەتی (قل من كان عَدُوّاً لجبريل) هاتە خوارەوە واتە: هەر کەسێ دوژمنی جوبرائیل بێ، بێگومان ئەو قورئانی بۆتۆ هێناوە، بە ئیزن خوا.

سێیەم: (اِسْرافِیل) فو لەقۆچەکە ئەکاو، دونیا وێران ئەکا (عن ابي سعيد: قال النبي ﴿ﷺ﴾ كَيْفَ أنْعَمُ؟ وَصاحِبُ الْقَرْنِ قَدْ الْتَقَمَ الْقَرْنَ وَاسْتَمَعَ الإذْنَ مَتىٰ يُؤْمَرُ بِالنَّفْخِ فَيَنْفُخُ﴾ رواه الترمذي، پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ فەرموی: چۆن خۆشی ببینم؟ وا خاوەن قۆچەکە (اسرافيل) قۆچەکەی خستۆتە دەمی و، چاوەڕوانی فەرمانی خوایە تا فوی لێ بکا، دونیا وێران بکا.

هەروەها (مَلَكُ الْمَوْت) کە پێی ئەڵێن (عِزْرائِیل) گیانی خەڵك دەردێنێ ﴿خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿قُلْ يَتَوَفّاكُمْ مَلَكُ الْمَوْتِ الَّذي وُكِّلَ بِكُمْ﴾ (السجدة) بڵێ: فریشتەی مردن گیانی ئێوە وەر ئەگرێ.

هەروەها (مُنْكَر وَنَكِير) پرسیار لە مردوو ئەکەن، (لە باسی ڕۆژی دوایی ڕوونی ئەکەینەوە) هەروەها دوو فریشتەی تر پێیان ئەگوترێ (الكِرام الكاتِبين) کردەوەو گوتەی ئادەمیزاد ئەنوسن، خوای گەورە فەرمویەتی ﴿عَنِ الْيَمِينِ وَعَنِ الشِّمالِ قَعِيدٌ﴾ ١٧ (ق) یەکیان لە ڕاستەدانیشتووەو، یەك لە چەپە.

جا بزانە: فریشتەی لای ڕاستە چاکە ئەنوسێ و فەرمانڕەوایە بەسەر فریشتەی لای چەپە، کە خراپە ئەنوسێ، واتە: تا فەرمانی بێ نەکا، ناتوانێ خراپەکە بنوسێ. هەروەها نۆزدە فریشتەی تر کارگێڕی دۆزەخن، پێیان ئەگوترێ (زَبانِيَة) گەورەکەیان ناوی (مالِك)ە خوای گەورە فەرمویەتی (عَلَيْها تِسْعَةَ عَشَرَ) ٣٠ (المدثر) نۆزدە فریشتە لەسەر دۆزەخن. هەروەها هەشت فریشتەی تر، هەڵگری (عەرشی) خودان، خوای گەورە فەرمویەتی ﴿وَيَحْمِلُ عَرْشَ رَبِّكَ فَوْقَهُمْ يَوْمَئِذٍ ثَمانِيَةٌ﴾ ١٧ (الحاقة) لە ڕۆژی قیامەت هەشت فریشتە عەرشی خوا هەڵئەگرن.



www.iqra.ahlamontada.com

هەروەهــا دوو فریشتەی تریش لە گەڵ هەرگیانلەبەرێك دان و، بەرەو دادگای مەحشەر ئەیبەن، خوای گەورە فەرمویەتی ﴿وَجاءَتْ كُلُّ نَفْسٍ مَعَها سائِقٌ وَشَهيدٌ﴾ ٢١ (ق) هەر گیانلەبەرێك هەیە دێتە مەحشەر فریشتەیەك لێی ئەخورێ‌و، یەکێکی تر شاهیدی لەسەر ئەدا. جگە لەمانەش ، فریشتە زۆرن و، کاری جۆراو جۆریان دراوەتە دەست،خوای گەورە فەرمویەتی ﴿وَما يَعْلَمُ جُنُودَ رَبِّكَ اِلاّ هُوَ﴾ ٣١ (المدثر) تەنها خوا ئەزانی، لەشکری خۆی چەندە، واتە فریشتە چەندە.

## « باسی جنۆکە - الجنّ »

جنۆکە: چینێکن خوای گەورە لە بڵێسەی ئاگر دروستی کردون، خوای گەورە فەرمـویەتی ﴿وَخَلَقَ اْلجانَّ مِن مارِجٍ مِنْ نارٍ﴾ە (الرحمن) واتە خوا جنۆکەی لە بڵێسەی ئاگر دروست کردون. جنۆکە نێرو مێ‌یان هەیەو، ئەوانیش وەکو ئادەمیزاد فەرمـانی خوا پەرستی‌یـان پێکراوە، خوای گەورە فەرمویەتی ﴿وَما خَلَقْتُ اْلجِنَّ وَاْلاِنْسَ اِلاّ لِيَعْبُدونِ﴾ ٥٦ (الذاريات) واتە من جنۆکەو ئادەمیزادم تەنها بۆ ئەوە دروست کردون تاکو بمپەرستن، کەوابوو، ئەوانیش کافرو موسوڵمانیان هەیە، هەر لە (مەککە)ی پیرۆز چینێکیان هاتنە خزمەت پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ گوێ‌یان لە قورئان گرت و موسڵمان بورن، (بروانە تەفسیری (سورة الجن)، وە (اِبْلیس) واتە: شەیتان لە جنۆکە کافرەکانە. جا هەرچی کافرەکانن بە لەشکری شەیتان ئەناسرێن و، بە ئاگری دۆزەخ سزا ئەدرێن، خوای گەورە فەرمـویـەتی ﴿لَاَمْلَئَنَّ جَهَنَّمَ مِنَ اْلجَنَّةِ وَالنّاسِ أجْمَعينَ﴾ ١٣ (السجدة) واتە: بڕیارم داوە دۆزەخ پڕ ئەکەم لە جنۆکەو، ئادەمیزاد.

## « ئاگاداری »

**ئەگـونجێ، فریشتــەو جنـۆکە لە سەر وێنەی (خۆ گۆڕیودا) بدیترێن. هەروەك لە حەدیسی (جبرائیل)دا هاتووە: کە سەحابە (جبرائیل) یان دیتووە، وە لە حەدیسی (اية الكرسي)دا هاتوە: کە (ابو هريرة) شەیتانی دیتووە، بەڵام لەســەر وێنــەی راستــەقینــەی خۆیــان جگــە لە پێغەمبەران هیچ کەسێك نایانبینێ. بروانە (البخاري ومسلم).ئینجا بزانە: بەبێ ویستی خوا، جنۆکە ناتــوانن زیان لە هیچ کەسێك بدەن کەوابوو:(اية الكرسى) بخوێنەو، لێیان مەترسە، چونکە ناتوانن نزیکت کەون، بروانە (البخارى ومسلم).**



www.iqra.ahlamontada.com

## ٣ ـ باوەڕ بە کتێبی خوا

ئەو (کتوبانەی) فەرمودەی خودان
راستن، کە هاتوون بو پێغەمبەران

(صُحُف)ی ابراهیم (تَوْراة)ی موسیٰ
(زَبُور)ی داود (اِنْجِیل)ی عیسیٰ

هەروەها (قرآن) لە بۆ پێغەمبەر
واته محمد ﴿ﷺ﴾ سەرداری بەشەر

لەو کاتەی قورئان هاتووتە خواریٰ
بێکار بوون ئەوان گشتی بە جاریٰ

سورەتەکانی قورئانی پیرۆز
سەدو چواردەیە، ئەی برای دڵسۆز

هەر کەس بخوێنێ سی جوزوی قورئان
زۆر خۆشەویستە لای خودای (منان)

ئەبێ باوەڕمان هەبێ کە خوای گەورە چەند کتێبێکی بۆ چەند پێغەمبەرێك ناردوە ﴿ﷺ﴾ اجمعین. تاکو رەفتاری پێ بکەن، ژمارەیان (١٠٤) کتێبە لەوانە دە (صُحُف) بۆ (ابراهیم) پێغەمبەر، (تَوْراة) بۆ (موسیٰ) پێغەمبەر، (زَبُور) بۆ (داود) پێغەمبەر (اِنْجِیل) بۆ (عیسیٰ) پێغـەمبەر (قُرْآن) بۆ پێغەمبەری ئیسلام حەزرەتی (محمد) ﴿ﷺ﴾ اجمعین.جا بزانە: بە هاتنی قورئانی پیرۆز، ئەم کتێبانە گشتیان لە کار کەوتن.

سەرەرای ئەمەش زانایانی جولەکەو دیانەکان دەستکاری ﴿تَوْراةُ﴾ و ﴿اِنْجِیل﴾ یان کـــردو، گۆڕینیان، بەڵام کەس ناتوانی دەستکاری قورئان بکات چونکە قورئان ﴿مُعْجِزَة﴾ی بەردەوامی پێغەمبەرە ﴿ﷺ﴾ کەوا بوو:

هەروەك خۆی ئەمێنێتەوە هەتا هەتایە، خوای گەورە فەرمویەتی (اِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا الـذِّکْـرَ وَاِنَّـا لَهُ لَحَافِـظُونَ) ٩ (الحجر) ئێمە قورئانمان ناردوّتە خوارەوە، ئێمەش پارێزەری قورئانین.

### « قۆناغەکانی هاتنە خوارەوەی قورئان »

**بزانە، جگە لە قورئانی پیرۆز ئەم کتێبانە بە تێکرایی هاتونەتە خوارەوە بەڵام قورئانی پیرۆز بە دوو قۆناغ هاتۆتە خوار:**

**قۆناغی یەکەم، لە (اَللَّوحُ المَحْفُوظ)ەوە، بە تێکرایی هێنراوەتە ئاسمانی دونیا، ئەم قۆناغە لە شەوی لیلة القدر بوو، خوای گەورە فەرمویەتی:**(اِنا اَنْزَلْنَاهُ فِي لَیلَةِ اَلْقَدْرِ) ئێمە قورئانمان ناردوّتە خوارەوە لە شەوی قەدر (لیلة القدر).

﴿وعن ابن عباس رض الله عنهما:اُنْزِلَ الْقُرْآنُ جُمْلَةً واحِدَةً حَتیَّ وُضِعَ فِي بَیْتِ اْلعِزَّةِ فِي سَماءِ اُلـدُّنْیا فَجَعَلَ جِبْرِیلُ یَنْزِلُ بِهِ عَلیٰ النبيّ ﴿ﷺ﴾ رواه الطبرانی والحاکم.

قورئانی پیرۆز بە تێکرایی ناردرایە خوارەوە، تالە (بَیْتُ اْلعِزَّة) داندرا، کە لە ئاسمانی



www.iqra.ahlamontada.com

دونیایە، ئینجا (جبرائیل) لەویوە دەستی پێ کردو،بەش بەش بۆ پێغەمبەری ﴿ﷺ﴾ هێنا خوارەوە.

قۆنـاغی دووەم: لە ئاسمـانی دونیاوە، هێنرا خوارەوە بۆ پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ ئەم قۆناغە لە (١٧) ی مانگی رەمەزان دەستی پێکردو، بە ماوەی (٢٣) ساڵ کۆتایی هات، خوای گەورە فەرمویەتی ﴿شَهْرُ رَمَضَانَ الَّذِي أُنزِلَ فِيهِ الْقُرآنُ﴾ ١٨٥ (البقرة) واتە:مانگی رەمەزان ئەو مانگەیەکە قورئانی تێدا هاتۆتە خوارەوە. (جا بزانە) ئەو رۆژە رۆژی دووشەممە بوو، بەرامبەر (١) شوباتی ساڵی (٦١٠)ی زایینی بوو، لەو کاتـە پێغـەمبەر ﴿ﷺ﴾ لە ئەشکەوتی (حِراء) بوو، کە لەلای سەرەوەی (مَکّە)یە، یەکەم جار. (جبرائیل) سورەتی ﴿اِقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذِي خَلَقَ﴾ تا ئەکاتە ﴿مَا لَمْ يَعْلَمْ) هێنایە خوارەوە ئینجا (جبرائیل) سورەت سورەت، ئایەت ئایەت، بە گوێرەی روداوو، پێویست بۆ پێغەمبەری ﴿ﷺ﴾ ئەهێنا خوارەوەو، شوێنی ئایەت و، سورەتی بۆ دیار ئەکرد بەو شێوەیەی لە (اَللَّوْحِ الْمَحْفُوظ) دانوسراوە، پێغەمبەریش ﴿ﷺ﴾ بە سەحـابەکانی رائەگەیاند، جا هەر بەو شێوەیەش بە ئێمە گەیشتووە، ئینجا بە ماوەی (٢٣) ساڵ کۆتـایی هات و، ژمـارەی سورەتـەکانی بووە (١١٤) سورەت، وەژمارەی ئایەتەکانی گەیشتە (٦٦١٦) ئایەت هەروەك (ابن عباس) فەرمویەتی، وە ئاخیر سورەت کە هاتووتە خوارەوە سورەتی﴿اِذا جاءَ نَصْرُ اللهِ﴾ بوو، وە ئاخیر ئایەت ﴿وَاتَّقُوا يَوْماً تُرْجَعُونَ فِيهِ اِلَىٰ اللَّهِ) بوو، ٢٨١ (البقرة).

ئینجاکە پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ وەفاتی کرد، ئەم قورئانە گشتی لە سینەی سەحابەکان دا پارێـزرابـوو، لە بەردو، پیستەو، ئێسقان دا نوسرابووەوە، ئینجا لە دوای ویش ئیمامی (عثمان) رضي الله عنه‌شەش دانەی تری لەسەر نوسیەوەو، بەسەر وڵاتانی ئیسـلامی دابـەشی کردن ئەم شەشـانـە پێیان ئەگوترێ ( اَلْمُصْحَفُ الاِمامُ) یان (اَلْمُصْحَفُ الْعُثْمانِیّ) کەوابوو: باوەرمان وایە ئەو قورئانەی لە (اَللَّوْحِ الْمَحْفُوظ) دا نوسراوەو، (جبرائیل) بۆ پێغەمبەری هێناوە، بەبێ هیچ گۆرانێك وا لەبەردەست ئێمەدایە.

## « قورئان بەرنامەی ژیانە »

بیرو باوەرمان وایە: ئەو خودایەی ئەم خەڵکەی دروست کردوە، ئەبێ هەر ئەویش کاروباری ئەم خەڵکە بەرێوەببا، کەوابوو: هەر ئەو خوایەش ئەزانێ کام یاسا باشە، رەفتاری پێ بکرێ؟ جا لەبەر ئەوە خوای گەورە هەر پێغەمبەرێکی ناردبێ، یاسای ژیانیشی بۆ ناردوە، تا بە ناردنی حەزرەتی محمد ﴿ﷺ﴾ کۆتایی ناردنی پێغەمبەرانی



www.iqra.ahlamontada.com

هێناو، قورئانی پیرۆزی بۆ نارد، تاکو ئەم خەڵکە بیکاتە بەرنامەی ژیان و ڕەفتاری پێبکا.

خوای گەورە فەرمویەتی ﴿إِنَّا أَنْزَلْنَا إِلَيْكَ الْكِتَابَ بِالْحَقِّ لِتَحْكُمَ بَيْنَ النَّاسِ بِمَا أَرَاكَ اللَّهُ﴾ ١٠٥ (النساء) واتە: ئێمە قورئانمان بۆ تۆ ناردوەتە خوارەوە تاکو داد لە نێوان ئەم خەڵکەدا بکەی بەو یاسایەی خوا پێی ناساندوی. هەروەها فەرمویەتی ﴿وَمَنْ لَمْ يَحْكُمْ بِمَا أَنْزَلَ اللَّهُ فَأُولَئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ﴾ ٤٤ (المائدة) واتە: هەر کەسانێك بەو یاسایە داد نەکەن، کە خوا ناردویەتیە خوارەوە: ئەوانە کافرن ﴿عن ابن عباس رضي الله عنهما في تفسير هذه الاية: مَنْ لَمْ يَحْكُمْ بِمَا أَنْزَلَ اللَّهُ جاحِداً بِهِ فَقَدْ كَفَرَ وَمَنْ أَقَرَّ بِهِ وَلَمْ يَحْكُمْ فَهُوَ ظَالِمٌ فاسِقٌ﴾ رواه ابن جرير (ابن عباس) فەرمویەتی: تەفسیری ئەو ئایــەتە ئەوەیە: هەر کەسێ دادبەم قورئانە نەکا، چونکە باوەری پێ نیە، ئەوە کافرە، بەڵام ئەگەر باوەری پێی هەبێ‌و، ڕەفتاری پێ نەکا ئەوە (زالم) و (فاسقە) هەروەك لە دوو ئایەتەکەی تردا، وای فەرمووە. کەوابوو: پێویستە گشت کاروبارێکی موسڵمانان، ئایینی‌و، ئابووری‌و، کۆمەڵایەتی و خێزان و، جەنگ وەسزای تاوانەکان، گشتحەرام وحەلالێك، بە گوێرەی یاسای قورئانی پیرۆز بێ، کەواتە: ناگونجێ وەزۆر لە ڕاستی دوورە: موسڵمــانێـك بڵێ: با کاروباری خواپەرستیم بە گوێرەی یاسای قورئان بێ‌و، کاروباری تریشم بە گوێرەی یاسای دەستکردبێ، چونکە بە هۆی ئەم ڕەفتارە نالەبارە بوو، خوای گەورە ڕەخنەی لە جووەکان گرت و، فەرموی ﴿أَفَتُؤْمِنُونَ بِبَعْضِ الْكِتَابِ وَتَكْفُرُونَ بِبَعْضٍ فَمَا جَزَاءُ مَنْ يَفْعَلُ ذَلِكَ مِنْكُمْ إِلَّا خِزْيٌ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَيَوْمَ الْقِيَامَةِ يُرَدُّونَ إِلَى أَشَدِّ الْعَذَابِ﴾ ٨٥ (البقرة).

واتە: ئایا باوەر بە پارچەیەکی کتێبی خوادێنن و، ڕەفتاری پێ ئەکەن و، باوەرتان بە پارچەکەی تر نیەو، ڕەفتاری پێ ناکەن؟ ئایا سزای ئەم جۆرە کەسانە چی‌یە؟ تەنها سەرشۆری‌یە لە دونیاو، لە ڕۆژی دوایی‌دا ئەگەڕێندرێنەوە بۆ ناو توندترین سزا کە دۆزەخە.

## « حەدیس ڕوون کەرەوەی قورئانە »

خوای گەورە فەرمویەتی ﴿وَمَا آتَاكُمُ الرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَاكُمْ عَنْهُ فَانْتَهُوا﴾ ٧ (الحشر) هەرچی پێغـەمبـەر ﷺ پێی ڕاگـەیـاندن وەری بگرن، وە هەرچی لێی قەدەغەکردن مەیکەن، کەوابوو: فەرمودەکانی پێغەمبەر ﷺ وەکو قورئانی پیرۆز، بە یاسای ئیسلام دائەندرێن ﴿عن ابي هريرة رضي الله عنه: قال النبي ﷺ: تَرَكْتُ فِيكُمْ أَمْرَيْنِ لَنْ تَضِلُّوا مَا تَمَسَّكْتُمْ بِهِمَا كِتَابَ اللَّهِ وَسُنَّةَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ رواه الامام مالك.



www.iqra.ahlamontada.com

واتە لە دوای خۆم دوو شتم بۆ ئێوە هێشتوتەوە، تا دەستیان پێوە بگرن گومڕا نابن، یەکەمیان قورئانی پیرۆز، دووەمیان حەدیسی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾.

## « وێکچووەکانی قورئان و حەدیس - مُتَشَابِهَاتُ ٱلْقُرآنِ وَٱلحَدِيثِ »

بزانە: لە قورئانی پیرۆزداو، لە حەدیسی پێغەمبەردا ﴿ﷺ﴾ چەند وشەیەك هەیە پێیان ئەگوترێ (مُتَشَابِهٌ) واتە: وێکچوویی، واتەی ئەم وێکچووانە ئاشکرا نیە: زانایانی ئیسلام دەربارەی ئەم وێکچووانە دوو جۆرە رایان هەیە: (یەکەم) رای پێشینان = (ٱلسَّلَفِ الصَّالِح) کە فەرمویانە: باوەرمان بەم وێکچووانە هەیەو، ئەیانخوێنینەوەو، لێیان ناکۆڵینەوە، جا لەبەر ئەوەی واتەی ئاشکرایان بۆ خوا ناگونجێ: ئەڵێین: تەنها خوا ئەزانێ مەبەستی چی‌یە؟

(دووەم) رای لە دوهاتووەکان = (ٱلْخَلَف) کە فەرمویانە: مانایەکی وایان لێ ئەدەینەوە: کە شایانی گەورەیی خوابێ‌و، بۆ زاتی خوا بگونجێ، نەوەکو نەزانەکان بە هەڵەدابچن و، واتێبگەن: خوا لاشەو، وێنەو، رەنگی هەیە.

## « هەندێك لەم وێکچووانە »

خوا ئەفەرموێ: ﴿يَدُ اللهِ فَوْقَ أَيْدِيهِم﴾ ١٠ (الفتح) واتەی (سَلَف): دەستی خوا لە سەرەوەی دەستی ئەوانە، جا تەنها خوا ئەزانێ مەبەستی بەم دەستە چی‌یە؟ (خَلَف) فەرمویانە : مەبەست دەسەڵاتە واتە: دەسەڵاتی خوا لە سەرەوەی دەسەڵاتی ئەوانە.

خوا ئەفەرموێ: ﴿وَيَبْقَى وَجْهُ رَبِّكَ﴾ ٢٧ (الرحمن) واتەی (سَلَف) رووی خوا ئەمێنێ، جا تەنها خوا ئەزانێ مەبەستی بەم رووە چی‌یە؟ (خَلَف) فەرمویانە: مەبەست زاتی خوایە: واتە زاتی خوا ئەمێنێ.

پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ ئەفەرموێ: ﴿انَّ قُلُوبَ بَنِي آدَمَ كُلَّها بَيْنَ اِصْبَعَيْنِ مِنْ أَصَابِعِ الرَّحمنِ كَقَلْبٍ واحِدٍ يَصْرِفُها كَيْفَ يَشاءُ﴾ رواه مسلم. واتە: دڵی هەموو ئادەمیزاد لە نێوان دوو پەنجەی خوادایە، وەکو یەك دڵ بە ویستی خۆی ئەیانگۆڕێ (سَلَف) فەرمویانە: تەنها خوا ئەزانێ مەبەست بەم دوو پەنجەیە چی‌یە؟ (خَلَف) فەرمویانە: مەبەست بەم دوو پەنجەیە: دوو سیفەتی خوایە کە (قُدْرَة) و (اِرادَة)یە. واتە: خوا توانای هەیە بە ویستی خۆی دڵیان بگۆڕێ. ئینجا لە هەموو وێکچووەکان بە کێشە تر ئەم ئایەتەیە ﴿الرَّحْمنُ عَلَى الْعَرْشِ اسْتَوى﴾ (٥ طه) گێردراوەتەوە: کە (امّ سَلَمَة) و (رَبيعَة) و ئیمام (مالِك) فەرمویانە : (اَلكَيْفُ غَيْرُ مَعْقُولٍ، وَالْاِسْتِواءُ غَيْرُ مَجْهُولٍ،



www.iqra.ahlamontada.com

وَالْإيمَانُ بِهِ وَاجِبٌ، وَالسُّؤَالُ عَنْهُ بِدْعَةٌ) اخرجه ابو القاسم اللالكائى في السنة.
چۆنیەتی (اِسْتِواء) نازاندرێ‌و، مانای دیارە: کە (جێگیر بوونە) واجبە باوەڕمان پێ هەبێ‌و، پرسیار لێکردنیشی (بِدْعَة)یە. کەوابوو: ڕای (سلف) ئەمەیە: کە (اِسْتِواء) سیفەتێکی خوایەو، چۆنیەتی نەزاندراوە. (خلف) فەرمویانە: مەبەست جێگیربوونی زاتی خوانیە، بەڵکو مەبەست ئەوەیە: کاروباری خوا لەسەر (عَرْش) جێگیر بووە واتە: (عَرْش) مەڵبەندی کاروباری خوای گەورەیە، بارەگای زاتی خوانیە. چونکە خوای گەورە لاشەی نیە، پێویستیشی بەهیچ شوێن و هیچ کات نیە. (١)

(١) لێرەدا چەند موسوڵمانێك رەخنەیان هەبوو: کەڕای (خلف) م نوسیوە، چونکە ئەم موسوڵمانانە وەها دەرسیان پێ‌گوتراوەو تێگەیاندراون: کە (خلف) لە (اهل السُّنّة والجماعة) نین و، بەڵکو کۆمەڵە زانایەکن بەهەواو هەوەسی خۆیان قسەیان کردوەو، گوێیان نەداوەتە (قرآن) و (حدیث) و، لە ڕارەوی (السلف الصالح) لایانداوە، کەوابوو: هیچ نرخێك بۆ ڕای (خلف) دانانـدرێ، بە تایبەتی لە باسی (عقیدة) چونکە شارەزای (عقیدە)نین. جا بۆ ڕاستکردنەوەی ئەم هەڵەیەو، ڕەواندنەوەی ئەم تەم و مژەئەم زانستە ئەخەمە بەرچاو، یەکەم: (السلف) بەو چینە زانا ئایینیانە ئەگوترێ: کە لەسەدەی یەکەم و، دووەم و، سێیەمی کۆچی دا ژیاون، وەکو (صحابة) و (التابعین) و (تابع التابعین)، دووەم: (الخلف) بەم چینە زانا ئایینیانە ئەگوترێ: کە لە سەدەی سێیەم بەم لایەوە ژیاون و، زانستی ئیسلامیان لە (سلف) وەرگرتوەو بە ئێمەیان ڕاگەیاندوە، سێیەم: (اهل السنة والجماعة) بەو کۆمەڵە موسوڵمانە ئەگوترێ: کە بە (قرآن) و (حدیث) و (اجماع) ڕەفتار ئەکەن و، باوەڕیان بە (خلافة الراشدین) ابوبکرو، عمرو، عثمان و، علی هەیەو، گشت (صحابە)کان بە دادپەروەر دائەنێن و، تانەیان لێنادەن و، هیچ موسوڵمانێکی گوناهبار بە (کافر) دانانێن تا (کفر)ی لێ ئەبینن... هتد. جا لەم پێناسەیە دەرکەوت: کە هەردوو چین (سلف) و (خلف) لە (اهل السنة والجماعة) ئەژمێردرێن، چونکە هەردوو چین ئەم بیروباوەڕەیان هەیە، کەوابوو هەرکەسێك ئەم بیرو باوەڕەی نەبێ، لە (اهل البدَع و الضّلالة) ئەژمێردرێ.ئینجا زۆرباش بزانە: کە خوای گەورە ئەفەرموێ (إِنَّمَا يَخْشَى اللَّهَ مِنْ عِبَادِهِ الْعُلَمَاءُ) واتە:لە بەندەکانی خوا تەنها زانایـان لە خوا ئەترسێن، پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ: (إنَّ العُلَماءَ وَرَثَةُ الأنْبِياء) بەڕاستی زانایان میراتگری پێغەمبەرانن علیهم الصلاة والاسلام.لەم ئایەت و حەدیسەدا خواو، پێغەمبەر ﷺ جیاوازی یان نەکردوە لە نێوان زانایانی (سَلَف) و (خَلَف)، کەوابوو: بۆچی جەنابت دژایەتی (خلف) ئەکەی؟ بەڵگەت چی‌یە: کە (خلف) بە هەوەسی خۆیـان قسـەیـان کردوەو، هیچیـان لە (عقیـدة) نەزانیـوە؟ ڕاستـە: ئەبێ زیـاتـر ڕێـزمـان بۆ (سلف) هەبێ بروانە لاپەرە (٢٨) بەڵام ڕێزلێنان شتێکەو، زانست شتێکی ترە، کەوابوو چینی (سلف) و چینی (خلف) هەردووکیان دۆستی خوداو، میراتگری پێغەمبەرن ﷺ ، خوای گەورەش لە حەدیسی (قودسی) دا ئەفەرموێ: (مَنْ عادى لي وَلِيًّا فَقَدْ آذَنْتُهُ بِالحَرْب) رواه البخاری، واتە: هەرکەسێك دژایەتی دۆستێکی من بکا بێگومان ئاگاداری ئەکەمەوە: کە جەنگی لەگەڵ ئەکەم. ئینجا بزانە: (سلف) و (خلف) هەردووکیان لە قوتابخانەی پێغەمبەر ﷺ پێگەیشتون و، بەبێ خیانەت بەگوێـرەی پـێویستی سەردەمی خۆیان بەرگری‌یان لە (عقیدە)ی ئیسلام کردوە، واتە: سەردەمی (سلف) خەڵك دەروونپـاك بوو، بیروبـاوەڕێکی بێگـەردیان هەبوو، لەبەر ئەوە (سلف) بێ دەنگی یان کرد لە وێکچووەکانی قورئان (متشابهات القرآن) و گوتیان: هەر خوا ئەزانێ مەبەستی چی‌یە؟ ئینجا گومرابووەکان واتە: (اهل البدَع والضلالة) ئەم بێ دەنگی یەیـان بە هەل و دەستکەوتێك زانی بۆ پەرتەوازەو شێواندنی (عقیدە)ی موسوڵمانان.وە (متشابهات القرآن) یان کردە بەڵگەی خۆیان کە ئەیانگوت. خوا لاشەو شوێنی هەیە.. هتد، ئینجا چینی (خلف) بۆ لێدانی ئەم گومرابووانە ناچار بوون: (متشابهات القرآن والحدیث) بەو جۆرە (تأویل) بکەن: کە لەگەڵ زاتی خوا بگونجێ‌و (قرآن)



www.iqra.ahlamontada.com

## « ئامۆژگاری »

ئەی موسڵمانی بەڕێز: باوەڕت بەهەبوونی خواو، تاك و تەنیایی خوا هەبێ بەو جۆرەی لەباسی باوەڕ بەخوابۆمان ڕوون کردیەوە، ئیتر لەوە زیاتر لە زاتی خوا مەکۆڵەوە، چونکە پێویست نیەو، سەرت لێ ئەشێوێ، وەهەرگیز واتێمەگەو باوەڕ مەکە: کە (سَلَف) شوێنیان بۆ خوا دیار کردبێ‌و، بڵێن: (خوا لەسەر عەرش نیشتەجێیە)، هەرگیز وایان نەگوتووەو، خۆیان بەم وێکچووانە خەریك نەکردوە، کەوابوو: تۆش وەکو ئەوان بیـانخوێنەوەو لێیان مەکۆڵەوە: چونکە ئەبێتە هۆی پەرتەوازەیی، تەماشاکە خوای گەورە فەرمویەتی:

﴿هُوَ الَّذِي اَنْزَلَ عَلَيْكَ الْكِتَابَ مِنْهُ آيَاتٌ مُحْكَمَاتٌ هُنَّ اُمُّ الْكِتَابِ وَاُخَرُ مُتَشَابِهَاتٌ فَاَمَّا الَّذِينَ فِي قُلُوبِهِمْ زَيْغٌ فَيَتَّبِعُونَ مَاتَشَابَهَ مِنْهُ ابْتِغَاءَ الْفِتْنَةِ وَابْتِغَاءَ تَأْوِيلِهِ وَمَا يَعْلَمُ تَأْوِيلَهُ اِلَّا اللهُ، وَالرَّاسِخُونَ فِي الْعِلْمِ يَقُولُونَ آمَنَّا بِهِ كُلٌّ مِنْ عِنْدِ رَبِّنَا وَمَايَذَّكَّرُ اِلَّا اُولُوا الْاَلْبَابِ﴾ ٧ (ال عمران) واتە: خوای گەورە قورئانی بۆ تۆ ناردۆتە خوارەوە، هەندێك لەم قورئانە ئایەتەکانی ئاشکرایەو، ئەوان مەبەستی بنەڕەتین لە قورئان (چونکە بۆ کاروباری ژیان بەکاردێن) وەهەندێکی تر لەم قورئانە ئایەتەکانی وێکچووەو، واتەیان ئاشکـرانیـە، جا ئەو کەسانەی لە ڕاستی لایانداوە: خۆیان بە ئایەتی وێکچووی خەریك ئەکەن،بۆ ئەوەی خەڵکی گومرا بکەن و بە گوێرەی ئارەزوی خۆیان مانای لێبدەنەوە، لە کاتێکا هیچ کەس مەبەستی ئەم وێکچووانە نازانی تەنها خوا ئەیزانی،

---

و (حدیث) یش پشتگیری ئەم (تأویل)ە بکا، ئینجا با (تەم و مژەکە برەوێنینەوە) چونکە ئێستاش گرۆهی دژ بە ئیسلام زۆرن و، بەناوی ئاین و، لەناو بەرگی ئیسلام دا خۆیان ئەهێننە بەرچاو، تاکو بەناوی دەرسی (عقیدە) و، خزمەتکردنی ئیسلام پەرتەوازە بێخنە ناو موسوڵمانان و، بیانکەنە دوژمنی (خلف) و، کتێبە کۆنەکان، کەوابوو: ئێستا پێناسەی چەند گرۆهێك ئەکەین کە لە (اهل البِدَع والضلالة) ئەژمێردرێن، یەکەم (شیعە) چونکە باوەڕیان بە (خلافة الراشدین) و، دادپەروەری (صحابە) نیە، دووەم (معتزلة) چونکە ئەڵێن: گوناهباری گەورەنە کافرەو،نەموسوڵمانەو، خوای گەورەش لە هەمـوو شوێنێکـە، سێیـەم: (خوارج) چونکە ئەڵێن: گوناهباری گەورە کافرەو، پێشەوای چوار (مذهب) کان و، شوێنێکەوتەی ئەوانیش گومڕان و، (جمعە) و (جماعة) لە دوای خەڵکی تر ناکەن، چونکە جگە لە خۆیان خەڵکی تر بە گومـڕابـوو دائـەنـێن، چوارەم: (مُجَسِّمة) و (جِهَوی) چونکە شوێن بۆ خوا دائەنێن و، ئەڵێن: خوا لەسەر (عرش) نیشتەجێیە، ئینجا بزانە: (سلف) و (خلف) لە (اهل السنة والجماعة) فەرمویانە: چونکە خوای گەورە لاشەی نیە: پێویستی بە هیچ شوێنێك نیە، کەوابوو: لەسەر (عرش)یش نیشتە جێ‌نیە، جگە لەمەش (عرش) دروستکراوێکە هەشت (ملائکة) هەڵیئەگرن، ئەوەش زۆر دژایەتی لەگەڵ خوایەتی خوا هەیە: کە (هەڵگیراوی هەڵگراوێکی تربێ)، ئینجا هەر کەسێك لەم ڕوونکردنەوەیە ڕەخنەی هەیە، زۆر سوپاسی ئەکەم بەڵگەیەکم بۆ بێنێ، بەڵام لە کتێبە کۆنەکانی میراتگرانی پێغـەمبـەر ﷺ کە بۆخوا کتێبەکانیان داناوە، نەك لەو نامیلکە ڕەنگاو ڕەنگانەی بۆ بانگەوازی (حِزبی) و (مَذْهَبی) داندراون و، بوختانیان بە (سلف) و (خلف) [illegible] داناوە.



www.iqra.ahlamontada.com

جا ئەو کەسانەی لە زانستدا ڕوچوون ئەڵێن: ئێمە باوەرمان بەم وێکچووانە هەیە گشتی فەرمودەی خوایە (واتە ناوێرن لێیان بکۆڵنەوە) جا هیچ کەس ئەم ئامۆژگاری‌یە وەرناگرێ تەنها خاوەن عەقلەکان وەری ئەگرن.

﴿عن عائشة رضي الله عنها قالت: تَلا رسولُ الله ﴿ﷺ﴾ هذه الآية ـ هو الذي انزل عليك الكتاب، الى قوله: اولو الالباب ـ فقال: اذا رَأَيْتُم الذِينَ يَتَّبِعُونَ مَا تَشَابَهَ مِنْهُ فَأُولَئِكَ الذِينَ سَمَّاهُمُ اللّهُ فَاحْذَرُوهُمْ﴾ رواه البخاری ومسلم. عائشة ئەفەرموێ: پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ ئەم ئایەتەی خوێندەوەو، فەرموی: هەر کاتێ ئەو کەسانەتان دیتن کە بە دوای وێکچووەکانی قورئان دا ئەگەرێن: ئەوانە ئەو جۆرە کەسانەن کە خوای گەورە لەم ئایەتەدا بە خراپە ناوی بردون، خۆتان لەم جۆرە کەسانە بپارێزن و، لێیان دور کەونەوە، واتە: چونکە سەرتان لێ ئەشێوێنن و، پەرتەوازەتان ئەکەن.

## ٤ ـ باوەڕ بە پێغەمبەرانی خوا

پێغەمبەر پیاوە، ڕاست گۆیەو هۆشیار — ڕێی چاك و خراپ ئەو ئەیکادیار
لە لای خوداوەند وەحی لە بۆ دێ — بێ عەیب و گوناهە، بە چاو ئەدیترێ
سەدو بیست و چوار هەزار پێغەمبەر — هاتون لە دونیا گشتی سەرانسەر (١)

پێغەمبەر، پیاوێکە لە لای خوای گەورەوە، فەرمانی پێکراوە، کە بانگەوازی بکا، بۆ ڕێگەی خودا، وە هەر لە لای خودا (وَحْی) لە بۆدێ‌و، بۆی دیار ئەکرێ: بە کام بەرنامە ڕەفتار بکا، جا ئێمەی موسڵمان باوەرمان وایە: کە هەموو پێغەمبەران ﷺ اجمعین. گشتیان ڕاست گۆو، ئەمینن و، لە فەرمانی خوا دەرناچن و، هەرچی خوا پێیان ڕابگەیەنێ ئەیلێن و، نایشارنەوە. جا بزانە: هەر پێغەمبەرێك لە لای خودا بەرنامەی بۆ هاتبێ‌و، فەرمانی ڕاگەیاندنیشی پێ کرابێ، ئەوە پێی ئەگوترێ: (رَسُول) و (نَبِيّ)، بەڵام ئەگەر فەرمانی ڕاگەیاندنی پێ نەکرابێ، تەنها پێی ئەگوترێ: (نَبِيّ)

(١) ـ (مُعْجِزَة) کارێکە بەعادەت لە توانای هیچ بوونەوەرێك دانیەو، خوای گەورە دروستی ئەکاو، لەسەر دەستی پێغەمبەران علیهم الصلاة والسلام ئەیهێنێتە دی، تاکو باوەریان پێ بکرێ کە ئەڵێن: (من پێغەمبەرم) وەکو نەسوتانی (ابراهیم) پێغەمبەرو، دار عەسای (موسی) پێغەمبەرو، پزیشکایەتی (عیسی) پێغەمبەر علیهم الصلاة والسلام، ئینجا بزانە: (قرآن) گەورەترین (معجزة)ی پێغەمبەرمانە ﷺ چونکە تا دونیاش وێران ئەبێ هیچ کەس ناتوانێ دەستکاری بکا، یان تەنها ئایەتێکیش وەکو (قرآن) دابنێ، ئینجا بزانە: پێغەمبەرمان ﷺ جگە لە (قرآن) (معجزة)ی تری هەیە: وەکو لە تکردنی مانگ و، هەڵقوڵانی ئاو لە نێوان پەنجەکانی دەستی‌و ... هتد. بڕوانە لاپەرە ٢٥ (کرامة) یش وەکو (معجزة)یە بەڵام خوا لەسەر دەستی دۆستانی خۆی (أَوْلِيَاء الله) ئەیهێنێتە دی، بۆ ڕێز لێنان، واتە: ئەم (وَلِي) یە نالێ: (من پێغەمبەرم) و، بەردەوام لە خوا ئەترسێ، وەکو بەسەرهاتی (مریم) و، (اصحاب الکهف) و، دیتن و، بانگ کردنی ئیمامی (عمر) لە (مدینە) وە: کە لە شکری ئیسلام لە (نهاوند) نزیك بوو گەمارۆ بدرێ. دانەر



www.iqra.ahlamontada.com

عن ابي ذر رضي الله عنه قُلْتُ:يا رَسُول الله ﷺ كَمْ الأَنْبياءُ؟ قالَ: ماْةُ اَلْفٍ نَبيّ وَأرْبَعَةَ وَعِشْرونَ اَلْفاً، قُلتُ: كَمْ الرُّسُلُ منْهُمْ؟ قالَ ثَلاثُماْةٍ وَثَلاثَةَ عَشَرَ) رواه أحمد وابن حِبّان والحاكم (وفي رواية وَخَمْسَةَ عَشَر) ئەبوو زەڕی غیفاری فەرمویەتی: گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ژمارەی پێغەمبەران چەندە؟ فەرموی: سەدو بیست و چوار هەزار پێغەمبەرن، گوتم: لەوانە چەندیان (رَسُولٌ)ن؟ فەرموی: سێسەدوسێزدە، لە روایەتێکی تردا ئەفەرموێ: سێسەدو پازدە. جا بزانە: تەنها ناوی (٢٥) پێغەمبەر لە قورئاندا هاتوە، ئەمەش ناوی بەڕێزیانە: آدم، اِدْریس، نوح، هود، صالح، ابراهیم، لوط، اسماعیل، اسحاق، یَعْقوب، یوسُف، أیوب، شُعَیْب، موسىٰ، هارون، ذوالكِفل، داود، سُلَیْمان، اِلْیاس،اَلْیَسَع، یونُس، زَكرِیا، یَحْیى، عیسى، مُحمّد، علیهم الصلاة والسلام.

## «ناپینی هەموو پێغەمبەران هەریەکە، بەڵام بەرنامە یان جیایە»

خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ بَعَثْنا في كُلِّ أُمَّةٍ رَسُولاً آنِ اُعْبُدُوا الله وَاجْتَنِبوا ...ُوتَ﴾ ٣٦ (النحل) واتە بۆ هەموو گەلێك پێغەمبەرێكمان ناردوە، تاكو خوا بپەرستن و، خۆتان لە (طاغوت) بپارێزن و، شوێنكەوتوی نەبن.

## « پێناسە »

طاغوت: بەو پێشەواو، خاوەن دەسەڵاتە ئەگوترێ، كە لە خوای گەورە یاخی ببێو، سنوری خوا بشكێنێو، یاسا دەستكردی خۆی بە سەر خەڵكی دابسەپێنێ، بە زۆرداری، یان بە فێڵبازی، یان بە خوێندنێكی نارەوا، كەوابوو: هەر كەسێك شوێنكەوتوی ئەم جۆرە كەسانە بێ، ئەوە لە ڕێبازی هەموو پێغەمبەران لایداوە، هەر چەند خوا پەرستیش بێ: چونكە شوێنكە وتوی (طاغوت) بووە.

جا لەم ئایەتە پیرۆزەو، چەند ئایەتێكی تر بۆمان ڕوون ئەبێتەوە: كە بانگەوازی هەموو پێغەمبەران ﷺ اجمعین،هەر بۆ یەك مەبەست بوە، كە خوا پەرستیو، دوور كەوتنەوە یە لە تاوانەكان، بەڵام هەر پێغەمبەرێك بەرنامەیەكی جیاوازی هەبووە لە گەڵ ئەوانی تر، هەروەك، خوا فەرمویەتی ﴿لِكُلٍّ جَعَلْنا مِنْكُمْ شِرْعَةً وَمِنْهاجاً﴾ ٤٨ (المائدة) واتە: هەر یەكێك لە ئێوە جۆرە یاساو بەرنامەیەكمان داوەتێ. جا هەروەك هەموو گەلەكانی سەر ڕوی زەمین پێغەمبەرێكیان بۆ ناردراوە: ئەو پێغەمبەرەش بە زمانی خۆیان بووە، خوای گەورە فەرمویەتی ﴿وَما اَرْسَلْنا مِنْ رَسُولٍ اِلاّ بِلِسانِ قَوْمِهِ لِیُبَیِّنَ لَهُمْ﴾ ٤ (ابراهیم) هەر پێغەمبەرێكمان ناردبێ، بە زمانی گەلەكەی خۆیان ناردومانە، تاكو بەرنامەی خوایان بۆ ڕوون بكاتەوە، كەوابوو: هەر پێغەمبەرێك تایبەت



www.iqra.ahlamontada.com

بە شوێنێـك و گەلێـك بووە، تا خوای گەورە کۆتایی ناردنی پێغەمبەرانی هێنا، بە ناردنیحەزرەتی (محمد) ﷺ بە تێکرایی بۆ دانیشتوانی سەر زەمین ناردراوە، جا ئادەمیزادبن، یان جنۆکە، خوای گەورە فەرمویەتی ﴿وَمَا أَرْسَلْنَاكَ إِلاَّ كَافَّةً لِلنَّاسِ﴾ ٢٨ (السبأ) واتە ئێمە تۆمان ناردووە (ئەی محمد) بە پێغەمبەر بۆ گشت کەس بە تێکـرایی، هەروەها فەرمویەتی ﴿وَلَكِنْ رَسُولَ اللهِ وَخَاتَمَ النَّبِيِّينَ﴾ ٤٠ (الاحزاب) بەڵام (محمد) ﷺ پێغەمبەری خوایەو، تەواوکەری پێغەمبەرانە ﷺ اجمعين، دوای وی هیچ پێغەمبەرێکی تر نایێ.

## باسی پێغەمبەرەکانی « أُولُوْ الْعَزْمِ »

**ڕانە پێنجیان گەورەو بەڕێزن ● ئەو (أُولُو الْعَزْم)ن گەلێ ئازیزن**

**(نوح و(ابراهیم) حەزرەتی (موسیٰ) ● (عیسیٰ)ی مەریەمەو (احمد) موستەفا**

ئینجا بزانە: لەو پێغەمبەرانەی ﴿مُرْسَل﴾ن پێنجیان بە (أُولُوْ الْعَزْم) ناو ئەبرێن کە ناویان لەم ئایەتەدا هاتووە ﴿شَرَعَ لَكُمْ مِنَ الدِّينِ مَا وَصَّىٰ بِهِ نُوحاً وَالَّذِي أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ وَمَا وَصَّيْنَا بِهِ إِبْرَاهِيمَ وَمُوسَىٰ وَعِيسَىٰ أَنْ أَقِيمُوا الدِّينَ وَلَا تَتَفَرَّقُوا فِيهِ﴾ ١٣ (الشـوری) خوای گەورە ئەو ئایینـەی بۆ ئێـوە داناوە، کە بە (نوح) پێغەمبەری ڕاگـەیـانـد وەو، بۆ تۆشمـان ناردوە (ئـەی محمّد)، وە بە (ابراهیم) و، (موسی)و (عیسی)شمـان ڕاگەیاندوە، کە ئەم ئایینە ئەنجام بدەن و، پەرتەوازەیی لە ئایین دا نەکەن. جا بزانە: جووەکان ئوممەتی حەزرەتی (موسی) پێغەمبەربوون و، دیانەکان ئوممەتی حەزرەتی (عیسی) پێغەمبەر بوون ﷺ بەڵام دەستکاری ئایینەکەی خۆیان کردو گۆڕییان.

ئینجا بزانە: چونکە جووەکان و دیانەکان باوەڕیان بە (قرآن) و، پێغەمبەری ئیسلام نیە: هەردووکیان بە (کافر) دائەندرێن.

## « باسی پێغەمبەری ئیسلام ﴿ﷺ﴾ »

**گەورەی هەموویان ﴿رَسُولُ اللَّه﴾یە ●واتە: (محمد)﴿ﷺ﴾ چرای دونیایە**

**هیچ پێغەمبەرێك لە دوای وی نیە ● کێ موسوڵمان بێ ئوممەتی وی یە**

گەورەی هەمـوو پێغـەمبـەران ﴿ﷺ﴾ اجمعين، بە گشتی حەزرەتی (محمد) ﴿ﷺ﴾ کە پێغەمبەری ئیسلامە ﴿عن ابي هريرة رضيَ الله عنه: قال النبي ﴿ﷺ﴾ أنا



www.iqra.ahlamontada.com

سيد ولد آدم يوم القيامة» واته من گەورەی نەوەی ئادەمم لە ڕۆژی قیامەت،
جا هەر لەبەر گەورەیی ئەم بەڕێزە بوو، خوای گەورە بەڵێنی لە هەموو پێغەمبەران وەرگرتووە، کە ئەبێ باوەڕ بە حەزرەتی (محمد) ﴿ﷺ﴾ بێنن، یارمەتیشی بدەن، «بڕوانە تەفسیری ئایەتی «٨١» لە «آل عمران» ئینجا بە ناردنی حەزرەتی (محمد) ﴿ﷺ﴾ خوای گەورە یاسای هەموو پێغەمبەرەکانی ڕەش کردەوە، ڕایگەیاند: کە جگە لە بەرنامەی ئایینی ئیسلام بە هیچ بەرنامەیەکی تر ڕازی نابێ، فەرمووی ﴿وَمَنْ يَبْتَغِ غَيْرَ الْإِسْلَامِ دِينًا فَلَنْ يُقْبَلَ مِنْهُ وَهُوَ فِي الْآخِرَةِ مِنَ الْخَاسِرِينَ﴾ ٨٥ (آل عمران) هەر کەسێ جگە لە ئیسلام ئایینێکی تری بوێ، (واتە بە بەرنامەی خوا پەرستیی و ژیانی دابنێ) ئەوە خوای گەورە لێی وەرناگرێ وە لە ڕۆژی دواییشدا لە زەرەرمەندەکانە.

## «ناوی دایک و باوکی پێغەمبەر» ﴿ﷺ﴾

باوکی پێغەمبەر (عبدالله)ی ناوە — دایکی (آمنە) هەروا زاندراوە
(عبدالمطلب) باپیری ویە — نەتەوە (عەرەب) ئەو (قوڕەیشی)یە

## «باسی لە دایک بوونی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾»

لە دوانزەی مانگی (ربیع الأول) — ڕۆژی دووشەممەی پرخۆشی و مەشخەڵ
لە (مەککە)ی پیرۆز ئەو لە دایک بوو — بەهاتنی وی دونیا ڕووناک بوو
چونکە پێغەمبەر باوکی نەمابوو — لەلای باپیری بەخێوکرابوو
(حلیمە)ی سەعدیە شیری پێداوە — تەمەن شەش ساڵ بوو، دایکی نەماوە

## «باسی هاتنی قورئان و، بوونی بە پێغەمبەر» ﴿ﷺ﴾

ڕۆژی دووشەممە حەقدەی ڕەمەزان — (جبرائیل) هات و، بۆی هێنا قورئان
لەشاری (مەککە) ئەشکەوتی (حیرا) — تاوەحی وەرگرت زۆر ئازار درا
جاری یەکەمین سوورەی (اقرأ) بوو — کرایە پێغەمبەر. تەمەن چل ساڵ بوو

## «کورتە ژیانێکی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾

پێغەمبەری خۆشەویستمان، ناوی (محمد) ﴿ﷺ﴾ کوری (عبدالله) کوری (عبدالمطلب) کوری (هاشم) لە هۆزی (قورەیشی) بوو، لە گەلی (عەرەب) بوو، لەشاری (مەککە) لە ڕۆژی دووشەممە (١٢)ی مانگی (رَبیعُ الأول) ساڵی (فیل) لە دایک بووە، کە ئەکاتە بەرامبەر (٢٠)ی (نیسانی) ساڵی (٥٧١)ی زایینی، کە تەمەنی بووە چل ساڵی تەواو، کرایە پێغەمبەر، لە ڕۆژی دووشەممە (١٧)ی مانگی ڕەمەزان بەرامبەر بە (١)ی (شوباتی) ساڵی (٦١٠)ی زایینی وەحی بۆ هات هەروەک باسمان



www.iqra.ahlamontada.com

کرد، کەواتــە: ئەو ڕۆژەی قور... ... هاتوتە خوارەوە هەر لەو ڕۆژەشدا کراوەتە پێغەمبەر ﷺ.

## «باسی سەرکەوتن و شەو ڕۆیی - الأسراء والمعراج»

لە مانگی (رجب) شەوی بیست و حەوت ● شەوڕۆیی کردو، بۆ ئاسمان سەرکەوت

باوەرمــان هەیــە: کە پێغــەمبــەر ﷺ بە سواری (بــوراق) شەو ڕۆیی کرد، (لەمــەککە)ی پیرۆزەوە، تاگەیشتە (المَسْجِدَ الأَقْصىٰ) لە فەلەستین، ئینجا لەوێوە سەرکەوت بۆ ئاسمانەکان و، لە ئاسمانی حەوتەم (اَلْبَيْتُ الْمَعْمُور)ی بینی، ئینجا بۆ (سِدْرَةُ الْمُنْتَهىٰ) بەرز کراوە، ئینجا بە خزمەت خوا شاد بوو، خوای گەورەی بینی، بەڵام چۆنیــەتی دیتنی نەزاندراوە، ئینجا هەر لەم شەوەدا گەڕاوە بۆ (مەککە) ئەم ڕووداوە گرنگە بەلاشەو بە گیانی پێغەمبەر بوو ﷺ لە شەوی (٢٧) رجب، ساڵ و نیوێك پێش کۆچ کردن، بڕوانە (البخاری و مسلم) لەگەڵ تەفسیری سورەتی (الأسراء).

## «باسی کۆچ کردنی بۆ مەدینە و، وەفات کردنی»

ماوەی سێزدە ساڵ کە بووە پێغەمبەر
هەر لە (مەککە) بوو پڕ، لە دەردەسەر
ئینجا کۆچی کرد لە بۆ (مەدینە)
لەوێوە داینا بناغەی ئەم دینە
لەوێش تا دە ساڵ هەر جیهادی کرد
لە دوای سەرکەوتن، جا وەفاتی کرد
گۆڕی پیرۆزی لە (مەدینە)یە
لە ناو مزگەوتە، دوو هاوڕێی هەیە
بیست و سێ ساڵان ئەو پێغەمبەر بوو
تێکڕاتەمەنی شەست و سێ ساڵ بوو

## «باسی کۆچ کردنی پێغەمبەر ﷺ بۆ مەدینە»

پێغەمبەر ﷺ ماوەی سێزدە ساڵ لە (مەککە) پێغەمبەرایەتی کرد، ئینجا کۆچی کرد بۆ (مەدینە) لە شەوی هەینی (٢)ی مانگی (ربیع الأول) ساڵی (١)ی کۆچی لە (مــەککــە) دەرچوو،بۆ (١٢)ی مانگ گەیشتە (قوبا) کە لە نزیك (مەدینە)یە، لەم سەفەرەدا ئیمامی (ابوبکر)ی صدیق هاوڕێی بوو، ئەم ڕووداوە بەیەکەمین ساڵی کۆچی دانـدراوە لە مێـژووی ئیســلامدا، وە ئەکاتە بەرامبەر (٢٠ تا ٣٠) مانگی (ایلول) ساڵی (٦٢٢)ی زایینی.

## « باسی وەفات کردنی پێغەمبەر ﷺ »

پێغەمبەر ﷺ ماوەی (دە) ساڵی تریش لە (مەدینە) پێغەمبەرایەتی کرد، ئینجا لە ڕۆژی دووشەممە (١٢)ی (ربیع الأول) ساڵی (١١)ی کۆچی لە مەدینە وەفاتی کرد، کە ئەکاتە بەرامبەر (٨)ی (حزیران) ساڵی (٦٣٢) زایینی. جا هەر لە ماڵی خۆی. لە



www.iqra.ahlamontada.com

ژوورەکەی حەزرەتی (عائشە)دا نێژراوەو، ئیمامی (ابوبکر)و ئیمامی (عمر)یش هەر لەو ژوورەدا نێژراون، ئێستا ئەو ژوورە کەوتۆتە ناو مزگەوتی پێغەمبەر ﷺ لە مەدینە، کەوابوو: ماوەی (٢٣)ساڵ پێغەمبەرایەتی کردووە، تەمەنی (٦٣) ساڵ بووە.

## « باسی خێزانەکانی پێغەمبەر ﷺ »

بزانە: ژنەکانی پێغەمبەر ﷺ پێیان ئەگوترێ (دایکی موسوڵمانان) خوای گەورە فەرموویەتی (اَلنَّبِيُّ اَوْلىٰ بِالْمُؤْمِنِينَ مِنْ أَنْفُسِهِمْ وَاَزْوَاجُهُ اُمَّهَاتُهُمْ) ٦ (الاحزاب) واتە: پێغەمبەر ﷺ لە پێشترە بۆ موسوڵمانان لە گیانی خۆیان، وە ژنەکانی پێغەمبەر ﷺ دایکی ئەوانن، ئینجا بزانە: یەکەمین و گەورەترین ژنەکانی پێغەمبەر ﷺ حەزرەتی (خدیجە)یە، کە یەکەمین موسوڵمانی سەر رووی زەمینە رضي الله عنها، هەروەها بزانە: کە پێغەمبەر ﷺ وەفاتی کرد، نۆژنی لە دوا بەجێ ما، کە ئەمانەن، سَوْدَة، عائِشة، حَفْصَة، اُمّ حَبِيبَة، اُمّ سَلَمَة، زَيْنَبَ بنت جحش، جُوَيْرِيَّة، صَفِية، مَيْمُونَة، رضي الله عنهن.

## « باسی منداڵەکانی پێغەمبەر ﷺ »

سێ کوری هەبوو رەسولی کەریم — عبداللەو، قاسم، لەگەڵ ابراهیم
چوار کیژی هەبوو، بڵێ یەکەمیان — ناوی (زینب)ە هیچ نیە گومان
(فاطمە) و (رقیە) جگە لەوانە — (ام کلثوم)ە زۆر باش بزانە

## « کورەکانی پێغەمبەر ﷺ »

پێغەمبەر ﷺ سێ کوری هەبوو، یەکەم (عبدالله) پێی ئەگوترا (طاهر) و (طیب) دووەم: (قاسم) سێیەم (ابراهیم) هەرسێکیان لەسەردەمی پێغەمبەر ﷺ بە منالی مردن.

## « کیژەکانی پێغەمبەر ﷺ »

پێغەمبەر ﷺ چوار کیژی هەبوو (زَيْنب) و (رُقَيّة) و (اُمّ كَلْثوم) ئەم سێیانەش هەر لەسەردەمی پێغەمبەر ﷺ وەفاتیان کرد، چوارەمینیان (فاطمە)یە، بەشەش مانگ، لە دوای وەفاتی پێغەمبەر ﷺ وەفاتی کردوە، ئەم (فاطمە)یە ژنی ئیمامی (علي)یەو، دایکی (حسن) و (حسین)ە، سەیدەکانی ئێستا لەم نەژادە پیرۆزەنە، جا بزانە: منالەکانی پێغەمبەر ﷺ گشتیان لە حەزرەتی (خدیجە)نە، تەنها (ابراهیم) نەبێ، دایکی وی ناوی (ماریە)یە، هەروەها بزانە:تەنها (فاطمة) منالی نێرینەی هەبووە.



www.iqra.ahlamontada.com

## « مامەکانی پێغەمبەر ﷺ »

پێغەمبەر ﷺ دوانزە مامی هەبوو، تەنها دوانیان موسوڵمان بوون، ١ـ ئیمامی (حمزە) لە جەنگی (أُحُد) شەهید کرا ٢ـ ئیمامی (عباس) لەساڵی (٣٢)ی کۆچی وەفاتی کرد.

## « باسی: الخلفاء الراشدين - چوار جێنشینەکانی پێغەمبەر ﷺ »

کە وەفاتی کرد ڕەسوڵی نازدار — کرانە جێنشین چوار پیاوی ڕێزدار
ابو بکرو، عمر، عثمان و،علی — پێیان ئەگوترێ (خليفه)ی (نبي)
یەك لە دوای وی دی ‌فەرمانڕەوابوو — ئیسلام سەربەرزو، لە زیندە دابوو

باوەڕمان وایە: گەورەترینی موسوڵمانان لە دوای پێغەمبەران ﷺ هەر چوار (خەلیفە)کانن واتە: ئیمامی (ابوبكر) و ئیمامی (عمر)و ئیمامی(عثمان) و ئیمامی (علي) رضي الله عنهم، گەورەیی‌و، جێ نشینییان هەر بەم ریزەیە، واجبە موسوڵمانان لە دوای قورئان و حەدیس، بە فەرمودەی ئەوانە رەفتار بکەن (عن العرباض بن سارية رَضِيَ اللهعنه:قال النبي ﷺ عَلَيْكُمْ بِسُنَّتي، وسُنَّةِ الخلفاءِ الرَّاشِدِينَ الْمَهْدِيينَ، عَضوُّا عَلَيها بالنَّواجِذِ) رواه الترمذي. ئێوە ڕێبازی من و، هەرچوار خەلیفەکانی دوای من بگرن، ئەوان شارەزای ڕێبازی منن و، لەسەر ڕێگەی ڕاستن، ڕێبازی ئەم چوارانە بەددان بگرن و بەری مەدەن.

## « العشرة المبشرة - دە کەسەکانی موژدە پێدراو بە بەهەشت »

باوەڕمان وایە: ئەو دە سەحابانەی پێغەمبەر ﷺ موژدەی بەهەشتی پێ‌داون: بە بەهەشت شاد ئەبن، کە ئەمانەن: هەر چوار خەلیفەکان،واتە:(ابو بكر، عمر، عثمان، علي. طلحة، زبير، عبدالرحمن بن عوف، سعد، سعيد، ابو عبيدة بن الجراح) (رواه الترمذي وابو داود) لە دوای خەلیفەکان ئەم شەشانە لە هەموو موسوڵمانان گەورەترن، ئینجا جەنگاوەرانی (بَدْر) ئینجا جەنگاوەرانی (أُحُد) ئینجا (بيعة الرِّضْوانِ) واتە: پەیمان بەستەی ژێردرەختەکە، ئینجا سەحابەکانی تر، ئینجا (تابعين)، واتە: ئەوانەی سەحابەیان دیتون،خوای گەورە فەرمویەتی: (وَالسَّابِقُونَ الأَوَّلُونَ مِنَ الْمهاجِرينَ وَالأَنْصارِوَالَّذِينَ اتَّبَعُوهُمْ بِأحْسانٍ رَضِيَ الله عَنْهُمْ وَرَضُوا عَنْهُ) ١٠٠ (التوبة) واتە: ئەو سەحابە پێشینیانەی کەلە کۆچکە رو، یارمەتی دەرانن، وە ئەوانەی شوێن ئەوانیش کەوتون بە چاکە: خواڵییان رازی بووەو، ئەوانیش لە خودا ڕازی بوون. کەوا بوو: ئەبێ ئێمە هەموو سەحابەکان بە پیاوی چاك دابنێین و



www.iqra.ahlamontada.com

بێدەنگی بکەین لەو کێشەی لە نێوان سەحابەکان دا روویداوە، (عن سعید رضي الله عنه:قال النبي ﷺ : لاتَسُبّوا أحداً مِنْ أصحابي فانَّ أحَدَكُمْ لَوْ أنْفَقَ مِثْل أحُدٍ ذَهَباً ما أدْرَكَ مُدَّ أحَدِهِم ولانَصيفَهُ) رواه البخاري و مسلم.جنێو بەسەحابەکانی من مەدەن، چونکە ئەگەر هەر یەکێکتان بە قەد کێوی (اُحُد) زێر ببەخشێ، ناگاتە مستێکی ئەوان و، نیو مستی ئەوانیش.

## «هەرسێك سەدەكان - السلف الصالح

هەروەها باوەرمان وایە کە ئەو کەسانەی لەوسێ سەدەیەدا ژیاون، کە پێغەمبەر ﷺ شاهیدی بۆ داون، لە هەموو کەس باشترن و، بە پێشینەی چاك ﴿اَلسَّلَفُ الصَّالِح﴾ ناو ئەبرێن ﴿عن عمران بن حُصَيْنْ رض الله عنه:قال النبي ﷺ اِنَّ خَيْرَكُمْ قَرْني ثُمَّ الذين يَلُونَهمْ ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ﴾ رواه البخاري و مسلم.واتە: چاکترینتان ئەوانەن کە لە سەدەی من داژیاون، ئینجا ئەوانەی دوای ئەوان، ئینجا ئەوانەی دوای ئەوان.

## « باسی دۆست و دوژمنی موسوڵمانان »

| | |
|---|---|
| سێ دۆستت هەیە لە گشت شوێن و کات | خواو، پێغەمبەرو، موسوڵمانی ڕاست |
| دوژمنت چوارن ئەی برای ڕێزدار | شەیتان و، نەفس و، کافرو، ستەمکار |

دۆستایەتی‌و، دوژمنایەتی (اَلْوَلاءُ وَالْبَراءَة)

واجبە موسوڵمان سێ کەس بە دۆستی خۆی دابنێ‌و، خۆشی بوێن و، پشت گیری‌یان بکا ١ـ خوای گەورە ٢ـ پێغەمبەرەخۆشەویست ﷺ ٣ـ موسوڵمانی ڕاست، خوای گەورە فەرمویەتی ﴿اِنَّما وَلِيُّكُمُ الله وَرَسُولُهُ وَالَّذِينَ آمَنُوا اَلَّذِينَ يُقيمُونَ اَلصَّلوٰةَ وَيُؤتُونَ الزَكواةَ وَهُمْ راكِعُونَ﴾ ٥٥ (المائدة) واتە: دۆستی ئێوە، تەنها خواو، پێغەمبەری خواو، ئیمانداراەکانن، ئەو جۆرە ئیماندارانەی نوێژ ئەکەن و، زەکات ئەدەن و، ملکەچی فەرمانی خواو پێغەمبەرن، واتە: ئەگەر موسوڵمان ئەم سێ مەرجەی لێ نەهاتە جێ، بەتەواوی مەیکە دۆستی خۆت، کەوابوو: واجبە بەهۆی ئیسلامەتی‌یەکەی خۆشت بوێ‌و، بەهۆی تاوانەکانی ڕقت لێ‌ی بێ.

هەروەها واجبە: چوار کەس بە دوژمنی خۆی دابنێ‌و، گوێ ڕایەڵیان نەبێ‌و، سەریان بۆ شۆرنەکا (١) شەیتان (٢) هەواو نەفس (٣) کافرەکان (٤) ستەمکارەکان.

(١) خوای گەورە فەرمویەتی ﴿اِنَّ الشَيْطانَ كانَ للأنسانِ عَدُوّاً مُبيناً﴾ ٥٣ (الاسراء) واتە: بێگومان، شەیتان دوژمنێکی ئاشکرای ئادەمیزادە.


www.iqra.ahlamontada.com

(٢) هەروەهــا خواى گەورە فەرمويەتى ﴿إِنَّ النَّفْسَ لَأَمَّارَةٌ بِالسُّوءِ﴾ ٥٣ (يوسف)
بێگومان نەفس واتە: هەواو هەوەسى خراپ، فەرمان بە خراپە ئەكا.
(٣) هەروەهــا فەرمــويەتى ﴿إِنَّ الْكَافِرِينَ كَانُوا لَكُمْ عَدُوًّا مُبِينًا﴾ ١٠١ (النساء)
بێگومان كافرەكان دوژمنى ئاشكراى ئێوەن، كەوابوو: جياوازى لە نێوان هيچ جۆرە كافرێك نيە، جا جولەكە بێ، يان ديان بێ، يان بێ باوەر، خواى گەورە فەرمويەتى ﴿يـاأَيُّهـاالَّـذِينَ آمَنُوا لاتَتَّخِذُوا الْيَهُودَ وَالنَّصارىٰ أَوْلِياءَ بَعْضُهُمْ أَوْلِياءُ بَعْضٍ وَمَنْ يَتَـوَلَّهُمْ مِنْكُمْ فَإِنَّـهُ مِنْهُمْ﴾ (٥١) (المائدة) ئەى ئيمانداران. جووەكان و ديانەكان مەكەنە دۆستى خۆتان، ئەوان دۆستى يەكترن،هەريەكێكتان بيانكاتە دۆست: ئەويش يەكێكە لەوان.
(٤) دەربارەى ستەمكارەكان خوا ئەفەرموێ ﴿وَلاتَرْكَنُوا الىٰ الَّذِينَ ظَلَمُوا فَتَمَسَّكُمُ النَّـارُ﴾ ١١٣ (هود) واتە دڵتان بەلاى ستەمكارانەوە نەروا، چونكە ئاگرى دۆزەخ ئەتـانگـرێتـەوە، جا بزانە: ئەگەر هاتو ئەم ستەمكارە موسوڵمان بوو، ئەبێ بەهۆى ستەمەكەى رقمان لێى بێ. (١)

(١) ـ مەبەست لەستەمكار (ظالم) ئەو كەسەيە: كارێكى نارەوا بەروا دابنێ، ئينجا ئەم پێناسەيە بە پلەى يەكەم ئەو كەسانەش ئەگرێتەوە: كە بە ياساى ئيسلام رەفتار ناكەن و، ياساى دەستكرد بەرەوا ئەزانن. خواى گەورە ئەفەرموێ: ﴿وَمَنْ لَمْ يَحْكُمْ بِمَا أَنْزَلَ اللَّهُ فَأُولَئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ﴾ هەر كەسانێك داد نەكەن بەو قورئانەى خوا ناردويە خوارەوە ئەوانە ستەمكارن. ئينجا ئەم فەرمودە پيرۆزەش ئەو كاربەدەست و گروهە (علمانى) يانە ئەگرێتەوە كە ئێستا خۆيان بەسەر وڵاتانى ئيسلامدا سەپاندوەو، بە قورئانى پيرۆز رەفتار ناكەن.
ئينجا بزانە: گوێرايەڵى بۆ ئەم ستەمكارانە ـ بە بيرو باورەوە، نەك بە ناچارى ـ رازى بوون بە بەرنامەيان ئەبێتە هۆى كافربوون، خواى گەورە ئەفەرموێ: ﴿وَإِنْ أَطَعْتُمُوهُمْ إِنَّكُمْ لَمُشْرِكُونَ﴾ ئەگەر گوێرايەڵى ئەوان بن لە حەرام و حەلاڵ. بێگومان ئێوە هاوبەش بۆ خوا دائەنێن. هەروەها رازى بوون بەكردەوميان و، دەرنەبرينى نارەزايى لە ستەمەكەيان و، يارمەتى دانيان و، باس كردنيان بەچاكە: ئەبێتە هۆى لادان لە رێبازى پێغەمبەر ﷺ. هەروەك خۆى ئەفەرموێ: ﴿سَتَكُونُ بَعْدِي أُمَرَاءُ مَنْ صَدَّقَهُمْ بِكَذِبِهِمْ وَأَعَانَهُمْ عَلَى ظُلْمِهِمْ فَلَيْسَ مِنِّي وَلَسْتُ مِنْهُ وَلَيْسَ بِوَارِدٍ عَلَيَّ الْحَوْضَ﴾ رواه النسائي. لە دواى من چەند كاربەدەستێك دێن، هەر كەسێك بەدرۆى ئەوان باوەربكاو، يارمەتى ئەوان بدا لە ستەمەكەيان: ئەو كەسە لە من نيەو، منيش لەوى نيم و، لەسەر حەوزى كەوسەر نايەتە لام. هەروەها يارمەتى دانيان بەزۆركـردنى كۆمەڵيان و، بەهێزكردنى گروهەكەيان: ئەبێتە هۆى سزاى دۆزەخ،پێغەمبەرﷺ ئەفەرموێ: ﴿الظَّلَمَةُ وَأَعْوَانُهُمْ فِي النَّارِ﴾ رواه الديلمي، ستەمكارەكان و يارمەتى دەريان لەناو ئاگرى دۆزەخ سزا ئەدرێن. ئەبێتە هۆى ژماردنى مرۆڤ لە چينى ئەوان. پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ: ﴿الرَّجُلُ عَلَى دِينِ خَلِيلِهِ فَلْيَنْظُرْ أَحَدُكُمْ مَنْ يُخَالِلُ﴾ رواه الترمذي. مرۆڤ لەسەر ئايين و رەوشتى دۆستى خۆيەتى، كەوابوو: هەر كەسەتان با تەماشابكا: ئايا دۆستايەتى كێ ئەكا؟ هەروەها دڵ بۆ لاچونيان و خۆشويستنيان ئەبێتە هۆى سەرشۆرى لە رۆژى قيامەت، پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ ﴿الْمَرْءُ مَعَ مَنْ أَحَبَّ﴾ رواه الشيخان. مرۆڤ لەگەڵ خۆشەويستەكەى دا حەشرى ئەكرێ، ئەى موسوڵمانانى بەرێز بايەخ پێدانى ﴿عقيدة الولاء والبراءة﴾ دۆستايەتىو دوژمنايەتى نيشانەى (ايمان) ى تەواوبێگەردە، چونكە پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ: ﴿أَوْثَقُ عُرَى الْإِيمَانِ الْمُوَالَاةُ فِي اللَّهِ وَالْمُعَادَاةُ فِي اللَّهِ﴾ رواه ابوداود. بەهێزترين دەستەويەكرى ئيمان:



www.iqra.ahlamontada.com

## (ئاگاداری)

خۆشـەویستی خواو پێغـەمبـەر ﷺ لەلایـەك، وە خۆشەویستی ئەم چوار دوژمنە لەلایەکی ترەوە، بەیەکەوە لەناو دڵی هیچ موسوڵمانێکدا ناگونجێ‌و، جێگەی نابێتەوە، چونکە خوای گەورە فەرمویەتی ﴿لَاتَجِدُ قَوْماً يُؤْمِنُوْنَ بِاللهِ وَالْيَوْمِ الْأَخِرِ يُوادُّوْنَ مَنْ حادَّ اللهَ وَرَسولَهُ وَلَو كانُوا آبائَهُم أَوْ أَبْنائَهُمْ أَوْ إِخْوانَهُمْ أَوْ عَشِيرَتَهُمْ﴾ ٢٢ (المجادلة واتە: هیچ گەلێکی وات دەست ناکەوێ، کە باوەڕیان بەخواو، ڕۆژی دوایی هەبێ‌و، لە هەمان کاتیشدا ئەو کەسانەیان خۆش بوێ، کە دژایەتی خواو پێغەمبەر ئەکەن، هەرچەند ئەم دژانە باوکی خۆیان بن یان کوڕی خۆیان بن یان برایان بن، یان هۆزی خۆیان بن.

## « باسی پێشەوای موسوڵمانان »

واجبە لەسـەر موسـوڵـمانان، پێشەوایەکی گشتی دابنێن و، بیکەنە جێنیشـی پێغەمبەر ﷺ، تاکو یاسای خودا لەسەر زەمینی خودا جێبەجێ بکا، خەڵکیش لە بەندایەتی بەندە ڕزگار بکاو، بیانکاتە بەندەی خودا، بەڵگەش ئەمەیە: سەحابەکان خوالێیـان ڕازی بێ، پێغـەمبەریان ﷺ بە خاك نەسپارد، تا ئیمامی (ابوبکر) یان هەڵبژارد بۆ جێنشینی پێغەمبەر ﷺ.

ئینجا بزانە: واجبە لەسەر هەموو موسوڵمانێك، گوێڕایەڵ بێ، بۆ ئەم پێشەوایەو، بۆ سەرکـردەکـانی تر، کە بەرەو خوار ترن، خوای گەورە فەرمویەتی ﴿أَطِيعُوا اللهَ وَأَطِيعُوا الرَّسُولَ وَأُولِي الْأَمْرِ مِنكُمْ﴾ ٥٩ (النساء) واتە: گوێڕایەڵی خواو پێغەمبەر ﷺ بن و، هەروەها گوێڕایەڵی کار بەدەستەکانی لە خۆتان بن.

جا بزانە: ئەگەر کار بەدەست پیاوی خراپیش بێ، نابێ لە فەرمانی دەرچین و نابێ لە دژی ڕاپەڕین، بەڵام بەو مەرجانە: کافر نەبێ‌و، فەرمان بە خراپە نەکاو، بە یاسای

---

دۆستایەتی کردنە لە پێناوی خواو، دوژمنایەتی کردنە لە پێناوی خوا، بزانە هەر لەبەر گرنگی (الولاء والبراءة) زانایانی ئیسلام فەرموویان: ﴿المحبة في الله والبغض في الله باب عظيم واصل من اصول الايمان﴾ خۆشویستن لە پێناوی خواو، ڕق لێهاتن لە پێناوی خوا، بەشێکی گەورەیەو، بنچینەیەکە لە بنچینەکانی ئیمان.

ئینجا ئەی موسوڵمانی بەڕێز: ئەم ئایەت و حەدیسانە بەڵگەیە لەسەر کەم باوەڕی ئەو کەسانەی بایەخ بە (عقيدة الولاء والبراءة) نادەن و، دۆستـایەتی ستەمکاران ئەکەن و، هەڵسان و دانیشتن و، هاتوچو لەگەڵ نوێژ نەکەر و، شەرابخۆرو، دزو جەردەو. هتد: بە پێشکەوتن و، ئاشتی خوازیو، کۆمەلایەتیو خزمەتی گەل و نیشتمان دائەنێن، هەمـوو هەوڵ و تێکـۆشـانیان بۆ ڕەزامەندی ئەم ستەمکارو تاوانبارانەیە، هیچ بیر لەوە ناکەنەوە، کە خوای گەورە ئەفـەرمـوێ: ﴿والله و رسوله احق ان يرضوه ان كانوا مؤمنين﴾ واتە: خواو پێغەمبەر ﷺ زیاتر شایانی ئەوەنە کە ڕازییان بکەن، ئەگەر ئەوان بەڕاستی ئیماندران، ئینجا ئەو کەسەی کەسە، ئەوەندەی بەسە. دانەر



www.iqra.ahlamontada.com

قورئان ڕەفتاربکا. (عن عبادة بن الصامت رضي الله عنه قال: ﴿بايَعْنا رسولَ الله ﷺ على السَّمْعِ وَالطَّاعَةِ في العُسْرِ وَاليُسْرِ، وَالْمَنْشِطِ وَالْمَكْرِهِ، وعَلَى أثرَةٍ عَلَيْنا وَعَلَى ألاّ نُنَازِعَ الأمْرَأهْلَهُ، قالَ: إلاّ إنْ تَروْا كُفراً بَواحاً عِندَكُمْ مِنَ اللهِ فِيهِ بُرهانٌ﴾ رواه البخاري ومسلم، واتە: پەیمانمان لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ بەست کە گوێرایەڵ بین، لە کاتی خۆشیو، ناخۆشی، هەر چەند گەورەکانیش جیاوازی لە نێوانماندا بکەن، وە پەیمانمان بەست، کە لە دژی کار بەدەستەکان ڕانەپەڕین مەگەر کافربونێکی ئاشکرا ببینن و، لەلای خوا بەڵگەیەکتان بەدەستەوە بێ.

ئیمامی (نواوی) لە (شرح مسلم) دا فەرمویەتی: قازی (عَیاض) ئەفەرموێ: زانایانی ئیسلام یەکدەنگن: کە نابێ کافربێتە کار بە دەست، وە ئەگەر هاتو کار بەدەست بووە کافر، لە گەورەیی ئەکەوێ، هەروەها ئەگەر کاربەدەست وازی لە نوێژکردن هێناو، فەرمانی بەنوێژکردن نەئەکرد، هەروەها فەرموی: ئەگەر گۆڕانکاری هێنا سەر شەریعەتی ئیسلام، یان بیدعەی بڵاوکردەوە، بەوانە لە کار بەدەستی ئەکەوێو، نابێ گوێرایەڵی بن و، واجبە لە دژی ڕاپەڕن و، یەکێکی باش بکەنە کاربەدەست، لەجێی وی.

## « جیهادو بانگەوازی ئیسلامی»

**پێناسە**: (جهاد) واتە: تێکۆشان بۆ بەرزکردنەوەی ئیسلام، بەچەسپاندنی حوکمی خودا لەسەر زەمینی خوداو، ڕزگارکردنی بەندەکانی خودا لە بەندایەتی بەندەو، کردنیان بە بەندەی خودا، ئەم تێکۆشانە: بەگیان و بە ماڵ و، بەزمان ئەکرێ، جا بزانە: (جهاد) بە چوار قوناغ پێگەیشتووە.

**یەکەم**:/ بانگەوازی نهێنی بەبێ جەنگ، ئەم قۆناغە بە تێپەڕبوونی شەش مانگ بەسەر هاتنی (وَحْی) دا دەستی پێکرد، کە سورەتی (يا أيها الْمُدَّثِّر قُم فأنذِرْ) هاتە خوارەوە، تا ماوەی سێ ساڵ بەردەوام بوو.

**دووەم**:/ بانگەوازی ئاشکرا بەبێ جەنگ، ئەم قۆناغە لە دوای ئەم سێ ساڵە دەستیپێکرد، بە هاتنە خوارەوەی ئایەتی (فَاصْدَعْ بِمَا تُؤْمَرُ) ٩٤ (الحجر).
واتە: ئاشکرا بکە، ئەو بانگەوازەی فەرمانت پێکراوە، تا کۆچ کردن بەردەوام بوو.

**سێیەم**:/ بانگەوازی ئاشکرا، شان بەشانی جەنگ کردن لەگەڵ ئەو کەسانەی جەنگ ئەکەن و، دەست درێژی ئەکەنە سەر ئیسلام، ئەم قۆناغە لە دوای کۆچ کردن دەستی پێ کرا، بە هاتنە خوارەوەی ئایەتی (وَقَاتِلُوا فِي سَبِيلِ اللهِ الَّذِينَ يُقَاتِلُونَكُمْ) ١٩٠ (البقرة) واتە: لە ڕێگەی خوا جەنگ لەگەڵ ئەو کەسانە بکەن کە جەنگتان لەگەڵ ئەکەن. تا ڕزگارکردنی (مەککە) بەردەوام بوو.



www.iqra.ahlamontada.com

**چوارەم:/** دوا قۆناغ، واتە:

بانگەوازی ئاشكرا شان بەشانی جەنگ كردن لەگەڵ ئەو كەسانەی باوەڕیان بە خوانیە، یان ئەبنە كۆسپ لە ڕێگەی بانگەوازی ئیسلامی، ئەم قۆناغە لە دوای ڕزگاركردنی مەككە دەستی پێكرا، بەهاتنە خوارەوەی (آيَةُ السَّيْف) واتە: ئایەتی شمشێر كە ئەمەیە (وَقَاتِلُوا الْمُشْرِكِينَ كَافَّةً) ٣٦ (التوبة) جەنگ لەگەڵ كافرەكان بكەن بەگشتی، جا لەم قۆناغەی چوارەم بڕیاری خوا دەربارەی (جهاد) جێگیر بوو، تا ڕۆژی دنیا وێران بوون هەر بەردەوامە (عن انس رضي الله عنه قال النبي ﷺ **اَلْجِهادُ ماضٍ مُنْذُ بَعَثَنِي اللهُ تَعالى اِلى اَن يُقاتِلَ آخِرُ هذِهِ الْاُمَةِ الدَّجالَ لايُبْطِلَهُ جَوْرُجائِرٍ وَلا عَدلُ عادِلٍ**) رواه أبو داود، واتە: جیهاد هەر بەردەوامە لەو ڕۆژەوە، كە خوامنی كردوتە پێغەمبەر، تا كۆتایی ئوممەتم جەنگ لەگەڵ (دَجّال) ئەكا، بەستەمی هیچ ستەمكارێك و، داد پەروەری هیچ داد پەروەرێك، بڕیاری جیهاد هەڵناوەشێنەوە. (١)

(ئەی موسوڵمانی خۆشەویست) شتێكی ئاشكراو بەڵگە نەویستە: كە ئیمرۆ (كُفر) بە هەر چوار جۆریەوە، وڵاتی ئیسلامی داگیر كردوەو، دادرەوایی (حاكِمِيَّة)ی خوای قەدەغە كردوە، كەوابوو: پێویستە بۆ گەڕاندنەوەی (حُكْم)ی خوا، ئەبێ بگەڕێینەوە سەر لوتكەی هەرەبەرزی ئیسلام كە (جهاد) كردنە لە ڕێگەی خوا، تاكو بناغەی (كفر) لە ڕەگ و ریشەوە دەركەین و (إِسْلام) ی لە جێ دابنێینەوە، خوای گەورە ئەفەرموێ.﴿وَقاتِلُوهُمْ حَتىّ لاتَكُونَ فِتْنَةٌ وَيَكُونَ الدّينُ كُلُّهُ لله﴾ الانفال ـ ٤٠، جەنگ لەگەڵ كافرەكان بكەن؟ تاكو دەسەڵاتی (كفر) نەمێنێو ئاژاوە نەبێو، گوێڕایەڵیو پەرستن گشتی بۆ خوای گەورەبێ.

---

(١) ئەی موسوڵمانی خۆشەویست: ئەوا حەدیسی (صحيح) لە پێش چاوە: كەواجبە (جهاد) هەر بكرێ هەر چەند گەورەو لێپرسراوەكانیشمان پیاوی خراپ بن و، واجبە گوێڕایەڵیان بین جا خۆشمان بوێن یان نا، چونكە (جهاد) واجبێكی زۆر گەورەیەو، نابێ بەهۆی تاوانباری چەند كەسێك دوا بخرێ، (ابن حجر) لە (تحفة) دا لە چەند ڕانایەك گێڕاویەتیەوە: كە (جهاد) لە پاش (ايمان) لە هەموو كردەوەكانی تر گەورەترە، پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ ئەفەرموێ: ﴿وذُروة سَنامه الجهاد﴾ رواه الترمذي. لوتكەی هەرە بەرزی ئیسلام (جهاد) كردنە.

جا ئەگەر لوتكە بەرزەكەمان لە دەست چوو: ئیسلامەتیمان بەچی بپارێزین؟ كەوابوو: گوێ مەدەئەو كەسانەی ئەڵێن: ئەمیرەكانمان پیاوی خراپن، یان ئەڵێن كاتی ﴿جهاد﴾ نەهاتوە، چونكە مردن زۆر نزیكەو، پێغەمبەریش ﴿ﷺ﴾ ئەفرموێ: ﴿من مات ولم يغز ولم يحدث نفسه به مات على شعبه من نفاق﴾ رواه مسلم، هەر كەسێك مردبێو، غەزای نەكردبێو، بە دڵیش نیازی غەزای نەبوبێ: ئەوە بە بەشێكی نیفاقەوە ئەمرێ. دانەر



www.iqra.ahlamontada.com

## «٥-«باسی باوەڕ بە ڕۆژی دوایی: «آليوم الآخر»

کاتێ کە مردی ئەی مرۆڤی هەژار دوو فریشتە دێن ئەکەونە پرسیار
کێیە خودای تۆ؟ هەروا پێغەمبەر ئایینت چییە؟ وەلام دە، یەکسەر
قەبر بۆ پیاو چاك باغی بەهەشتە لە بۆ پیاو خراپ پڕ ئاگرو سەختە

ڕوکنی پێنجەمینی ئیمان. باوەر بە ڕۆژی دوایی‌یە، مەبەست بە ڕۆژی دوایی ژیانێکی ترە، لە دوای ژیانی دونیا، واتە: ئەم ژیانە لە مردنەوە دەست پێ ئەکا هەروەك پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی ﴿مَنْ مَاتَ فَقَدْ قَامَتْ قِيَامَتُه﴾ رواه الطبراني، والدَّيْلَمِي، واتە: هەر کەسێك مرد، ئەوە دوا ڕۆژی داهات، جابزانە: ئەم ژیانەی ڕۆژی دوایی، دوو قۆناغە: یەکەم: زیندوبوونەوەی قەبرە **دووەم**: زیندوبوونەوەی قیامەت ﴿عن عثمان رضي الله عنه قال النبي ﷺ انَّ الْقَبْرَ أَوَّلُ مَنازِلِ الأَخِرَة﴾، رواه الترمذي، زیندو بوونەوەی قەبر یەکەم قۆناغی ڕۆژی دوایی‌یە.

جا بەم ژیانەی قەبر ئەگوترێ (بَرْزَخ) واتە: پەردەی نێوان دونیا و زیندووبونەوەی ڕۆژی قیامەت، خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿وَمِنْ وَرائِهِمْ بَرْزَخٌ الىٰ يَوْمِ يُبْعَثُونَ﴾ ١٠٠ (المؤمنون) لە بەردەم ئەو مردوانە پەردەیەك هەیە تا ئەو ڕۆژەی زیندو ئەکرێتەوە، کەوابوو: هەموو جۆرە مردوێك لە دوای مردن زیندوو ئەکرێنەوە، جا نێژرابێتە ناو خاك، یان، نا، سوتێنرابێ، یان درندە خواردبیتی، یان، یان،

## «باسی پرسیارو ئازاری قەبر»

﴿عن البراء رضي الله عنه:قال النبي ﷺ: اسْتَعِيذُوا بِاللهِ مِنْ عَذابِ الْقَبْرِ، ثَلاثَ مَراتٍ، ثُمَّ قَالَ: إنَّ الْمُؤمِنَ اذا وُضِعَ فِي قَبْرِهِ وَتَوَلىٰ عَنْهُ اصحابُهُ وَهُوَ يَسْمَعُ خَفْقَ نِعالِهِمْ، يأتيه مَلَكانِ، فَيُجلِسانه فيقُولانِ لَهُ: مَنْ رَبُّكَ؟ فَيقُولُ:رَبِّيَ الله، فيقولانِ لَهُ مَادِينُكَ؟ فَيقُولُ:ديني الأسْلامُ، فَيقُولانِ لَهُ:ماهَذا الرَّجُلُ الذي بُعِثَ فِيكُمْ؟ فَيقُولُ:هُوَ رَسُولُ الله ﷺ فذالِكَ قَوْله تعالىٰ ﴿يُثَبِّتُ اللهُ الَّذينَ آمَنُوا بِالْقَوْلِ الثَّابِتِ فِي الْحَياةِ الدُّنْيا وَفِي الْآخِرَةِ﴾ ثُمَّ قال: فَيُنادِي مُنادٍ مِنَ السَّماءِ:أنْ قَدْ صَدَقَ عَبْدِي فَأَفْرِشُوهُ مِنَ الجنَّةِ، ثُمَ قال: فيأتيه مِنْ رَوْحِها وَطِيبِها وَيُفْتَحُ لَهُ مَدَّ بَصَرِهِ، ثُمَّ قالَ فِي الْكافِرِ أو الْمنافِقِ: فَيقُولانِ لَهُ:مَنْ رَبُّكَ؟ فَيقُولُ: هاهاهْ لا آدري فَيقُولانِ: ما دِينُكَ؟ فَيقُولُ: هاهْ هاهْ لاأدْرِي فَيقُولانِ: ماهَذا الرَّجُلُ الَّذي بُعِث فِيكُمْ فَيقُولُ: هاهْ هاهْ لا آدري، فَيُنادي مُنادٍ مِنَ السَّماءِ: أنْ كذَبَ عَبْدِي فَأفْرِشوهُ مِنَ النَّارِ. ثمَّ قالَ: فَيأتيهِ مِنْ حرها وَسَمومِها، وَيُضَيَّقُ عَلَيْهِ قَبْرُهُ حَتَّىٰ تَخْتَلِفَ فِيهِ أضْلاعُهُ﴾



www.iqra.ahlamontada.com

•• الحديث بطوله. رواه الامام أحمد، وأبو داود، ئەم حەدیسە زۆر درێژە تەنیا کورتەیەکمان نوسیوە. واتە: پێغەمبەرﷺ سێ جار فەرموی: خۆتان بەخوا بپارێزن لە ئازاری قەبر، ئینجا فەرموی: کە موسوڵمان خرایە ناو قەبرو، هاورێکانی گەڕانەوە، گوێی لە دەنگی پێلاوەکانیانە، دوو فریشتە دێن (مُنْکَر، وَنَکِیر) دایئەنیشێنن و، لێی ئەپرسن: خوای تۆکێیە؟ ئەڵێ: خوای من (الله)یە، دووبارە لێی ئەپرسن: ئایینت چییە؟ ئەڵێ: ئایینم ئیسلامە، جا لێی ئەپرسن: ئەو پیاوەی، واتە ئەو (محمد)ەی ناردرابـووە لای ئێـوە، کێبـوو؟ ئەڵێ: پێغـەمبەری خوا بوو ﷺ جا پێغەمبەر ﷺ فەرموی: ئەم وەڵامە راستە، واتەی ئەم ئایەتەیە، کە خوا فەرموویەتی: خوای گەورە زوبانی ئیمانداران راست ئەکا بە گوتەی راست لە دونیاو، لە رۆژی دوایی، ئینجا فەرمـووی: بانگـەوازی لە ئاسمـانەوە ئەکرێ: بەندەی من راست ئەکا، کەوابوو، لەبـەهەشت بۆی رابێخن، ئینجا بۆنە خۆشەکەی بە هەشتی بۆدێو، گۆرەکەی بۆ بەرفراوان ئەکرێ بە قەد چاو دیتن.

هەروەهـا پێغـەمبەر ﷺ دەربارەی کافرو، موناففەکان فەرموی: لێی ئەپرسن: خوای تۆکێیە؟ ئەڵێ: هاه، هاه، نازانم، جا لێی ئەپرسن ئایینت چییە؟ ئەڵێ: هاه هاه، نازانم،جا لێی ئەپرسن: ئەو پیاوەی ناردرابووەلای ئێوە، واتە ئەو (محمد)ە کێ بوو؟ ئەڵێ: هاه هاه، نازانم، جا بانگەوازی لە ئاسمانەوە ئەکرێ: ئەوە درۆی کرد، کەوابوو: لە ئاگـر بۆی رابێخن، ئینجـا گەرمـایی‌و، هەنـاسەی دۆزەخی بۆدێو، گۆرەکەی بەرتەسك ئەکرێ، تا پەراسووەکانی تێك ئەچەقن. جا (بزانە): ئەم خۆشی‌و، ئازارەی قەبر، تا زیندو بوونەوەی قیامەت، هەر بەردەوامە ﴿عن ابي سعيد رضي الله عنه قال النبي ﷺ اِنَّمَا اَلْقَبْرُ رَوْضَةٌ مِنْ رِيَاضِ اَلْجَنَّةِ أَوْ حُفْرَةٌ مِن حُفَرِ النَّارِ﴾ رواه الترمذي، واتـە: قەبـر یان باغێکە لە باغەکانی بە هەشت، یان قۆرتێکە لە قۆرتەکانی ئاگر.

**(ئـاگـاداری)** ئەم پرسیـارو، خۆشی‌و، ئازارەی دوای مردن، بۆ گیـان و، لاشـەی مردووەکـەیـە، بەڵام: نەك لاشـەکـەی دونیا چونکە ئەم گیانە، تا زیندوبوونەوەی قیـامـەت، ئەچێتـە ناو لاشـەیەکی (بَرْزَخی) کە وەك لاشەی فریشتەو جنۆکە، لە هەموشوێنێك جێی ئەبێتەوەو، بە چاو نابینرێ، کەوابوو: ئێمە چۆنیەتی ئەم لا شەیە نازانین، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا، گیانی مردووەکە، جۆرە پەیوەندییەکی بەلاشەکە دونیـاوە هەیـە، هەرچـەنـد ئەم لاشەیەش رزی بێ، یان سوتێنرابێ، یان درەند خواردبیتی، چونکـە کلینجـەی ئادەمیزاد بە هیچ جۆرێك لە ناو ناچێ‌و، تا رۆژی قیامەت هەر بەساغی ئەمینێتەوە ﴿عن ابي هريرة رضي الله عنه قال النبي ﷺ لَيْسَ مِنَ الْأِنْسَانِ شَيْءٌ اِلَّا يَبْلَىٰ، اِلَّا عَظْماً واحِداً وَهُوَ عَجْبُ الذَّنَبِ﴾ رواه البخ



www.iqra.ahlamontada.com

ومسلم، واتە: هەر ئەندامێکی ئادەمیزاد هەیەگشتی لە ناو ئەچێ، تەنها یەك ئێسقان ئەمێنێتـەوە کە ناوی کلینجـەیـە، (ئـەم ئێسقانە زۆر بچکۆڵەیە ئەکەوێتە کۆتایی زنجیرەی کۆڵەکەی پشتی ئادەمیزاد).

ئینجا بزانە: شەهیدی رێگەی خودا، لەم پرسیارو، ئازارە پارێزراوە، گیانی وی لە ناو باڵندە سەوزەکانی بەهەشتەو، بە دڵی خۆی لە بەهەشت ئەسورێتەوە، بروانە (صحیح مسلم)

## « قۆناغەکانی ژیانی ئادەمیزاد »

گشت ئادەمیزادێك، ژیـانی دونیـاو، قیـامەتی بە پێنج قۆناغدا ئەروا، هەر قۆناغێکیش لە قۆناغەکەی تر جیایە.

**یەکەم/** قۆناغی (نُطْفَة) واتە: کرمی ناو ئاوی پیاو، ئەم کرمە جۆرە زیندوەرێکە لەناو ئاوی پیـاودایە، وەك زێروی ناو چڵکاوە، بەهۆی ئامێری (میکرۆسکۆب) ئەبینرێ، خوای گەورە فەرمویەتی ﴿خَلَقَ ٱلْأنْسَانَ مِنْ عَلَقٍ﴾ ٢ـ العلق) خوا ئادەمیزادی لە (عەلەق) دروست کردوە، واتەی (علق) بەزێروش ئەگوترێو، بەخوێنی مەییش ئەگوترێ.

**دووەم/** قۆناغی کۆرپەی ناو زگ‌لە دوای سەد و بیست رۆژ کۆرپەی ناو زگ گیانێکی تری ئەدرێتێ کە لە (نُطفە) جیایەو ئەجولێتەوە، لە گیانی دونیاش جیایە تا لە دایك ئەبێ، چونکە شێوەی هەناسەدان و خواردنی جیایە.

**٣ـ سێیەم/** قۆناغی دونیا، کەلەدایك بوونەوە دەست پێ ئەکا، تامردن.

**چوارەم/** قۆناغی (بَرْزَخ) کەلە مردنەوە دەست پێ ئەکا، تا زیندوبوونەوەی قیامەت.

**پێنجەم/** قۆناغی رۆژی دوایی: کە ئاخیر قۆناغەو مردنی بەدوا دانایێ، ئەمەش لە زینـدوبـوونەوەی رۆژی قیامەتەوە دەست پێ ئەکا، هەروەك باسی ئەکەین. خوای گەورە فەرمویەتی ﴿وَإِنَّ ٱلدَّارَ ٱلْآخِرَةَ لَهِيَ ٱلْحَيَوانُ لَوْكَانُوا يَعْلَمُونَ﴾ ٦٤ (العنکبوت) بەراستی ژیانی رۆژی دوایی ژیانێکی بەردەوامە، ئەگەر زانستی تەواوتان هەبێ: لە دەست خۆتانی نادەن. جا بەزانینی ئەم قۆناغانە باوەرمان بەزیندوبوونەوەی ناو قەبر بەهێزتر ئەبێ.

## « باسی خێرکردن بۆ مردو »

﴿عن عائشة رضي الله عنها، قال رجلٌ:يا رسول الله اِنَّ اُمّی اُفْتُلِتَتْ نَفْسُها وَلَم تُوص، وَأظُنّها لَوْ تَكَلَّمَتْ تَصَدّقَتْ أفَلَها اَجْرٌ اِنْ تَصدَّقْتَ عَنها؟ قالَ: نعم﴾ رواه البخاری ومسلم، پیـاوێـك گوتی:ئەی پێغـەمبـەری خوا ﷺ دایکم لەناکاو مردوە، وەسێتی



www.iqra.ahlamontada.com

نەکردوە، ئایا ئەگەر من خێری بۆ بکەم خێرەکەی ئەگاتێ؟ فەرموی: بەلێ، کەوابوو: مردوو سود لە کردەوەی کەسانێکی تر وەرئەگرێو، خێرەکەی پێ ئەگا. (١)

## باسی تێکچونی دونیاو، زیندوبوونەوە

یـەك مەلائیکـە بـە ئەمـری خـودا — بەیەك فوکردن دونیاتێك ئەدا
کـە هیچ کەس نەما خـوا ئەمر ئەکا — بۆجاری دووەم فوێکی تر ئەکا
هەرچی گیانداره هەرومك، یەکەمجار — زیندو ئەبێتەو، دێتە وەگوفتار.

## (روون کردنەوەی تێکدانی دونیاو، زیندوبوونەوەی رۆژی قیامەت)

هەرکاتێك خوای گەورە ویستی دونیا وێران بکا، فەرمان ئەداتە فریشتەیەك کە ناوی (اسرافیل)ە، فوو لە (صُور) ئەکاو، ئەم دونیایە بەئاسمان و زەمینەوە تێك ئەدا، هەروەهـا گشت گیـانلەبـەرێکیش ئەمـرێ، جگـە لە هەنـدێـك فریشتـە، بەم دونیاتێکدانەش، ئەگوترێ (اَلسَّاعَة) ئینجا پاش چل ساڵ، خوای گەورە فەرمانی پێ ئەکاتەوەو دووبارە؛ فوو لە (صُور) ئەکاتەوە، گشت گیانداریك زیندوو ئەبێتەوە، بەم زیندوو بوونەوەیە ئەگوترێ: (اَلْقِيَامَة) خوای گەورە فەرمویەتی ﴿وَنُفِخَ فِي الصُّورِ فَصَعِقَ مَنْ فِي السَّموٰاتِ وَمَنْ فِي الْأَرْضِ اِلاَّ مَنْ شَاءَ اللهُ ثُمَّ نُفِخَ فِيهِ أُخْرىٰ فَاذا هُمْ قِيامٌ يَنْظُرُونَ﴾ ٦٨ (الزمر) فو لە (صور) ئەکرێ، ئینجا هەرچی لەئاسمان و زەمینە، گیانی دەرئەچێ جگە لەو کەسانەی خوا حەز بکا نەمرن، ئینجا دوو بارە فوی لێ ئەکرێتەوە گشتیان زیندو ئەبنەوەو، چاوەروان ئەکەن چیان بەسەردێ؟ (عن عبد الله بن عمرو رضي الله عنه:سئِلَ النبي ﷺ مَا الصُّورُ؟ قالَ: قَرنٌ يُنْفَخُ فِيهِ) رواه الترمذي وأبو داود، پرسیار لە پێغەمبەر ﷺ کرا ئایا (صور) چییە؟ فەرموی: قۆچێکە فوی لێ ئەکرێ.

جابـزانـە: لەم زینـدوبـوونـەوەی (قیـامەت) لاشەکەی دونیا بە تەواوی دروست ئەکرێتەوەو، گیانی دێتەوە ناو، خوای گەورە فەرمویەتی ﴿كَمَا بَدَأْنَا أَوَّلَ خَلْقٍ نُعِيدُه﴾ ١٠٤ (الانبياء) هەروەك دروست کردنی یەکەم، دووبارە دروستی ئەکەینەوە ﴿وعن ابي هريرة رضي الله عنه قالَ النبي ﷺ كُلُّ ابْنِ آدَمَ يَأْكُلُهُ التُّرابُ الاَّ عَجْبَ الذَّنَبِ، مِنْهُ خُلِقَ وَفيهِ يُرَكَّبُ﴾ رواه مسلم، گشت ئەنـدامی ئادەمیـزاد ئەبێتەوە خۆل، تەنها

(١) دوعا کردنیش بۆ مردوو یەکێکە لەم کردەوانەی سودی بۆ مردوو هەیە، پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ ئەفەرموێ: ﴿اذا مات ابن ادم انقطع عمله الا من ثلاث: صدقه جارية، او علم ينتفع به، او ولد صالح يدعو له﴾ رواه مسلم،کاتی ئادەمیزاد ئەمرێ خێرەکردەوەکانی ئەبڕێتەوە، تەنها سێ کردەوە نەبێ: خێرێکی بەردەوامی نەبڕاوە، زانستێکی بەسود، رۆڵەیەکی باش کە دوعای بۆ بکا. دانەر



www.iqra.ahlamontada.com

کلینجە نەبێ، هەر لەو کلینجەیە دروست کراوەو، هەر لەویش دووبارە دروست ئەکرێتەوە.

## « باسی وەستانی مەیدانی مەحشەر - الحشر »

هەندێک بەسواری هەندێک بە پێیان
هەندێک رائەکشێن لەسەر رووی خۆیان
بەرەو مەیدانی مەحشەر ئەبردرێن
تا خوا حەزبکا لەوێ رائەگرێن
لە ترسان هیچ کەس خزمی کەس نیە
رۆژ نزیک ئەبێ و سێبەری نیە
لەبەر گەرمایی ئارەق دێتە خوار
زۆر کەس لە گۆمی ئارەق دەچنە خوار

بزانە: کە ئەم خەڵکە زیندو بووەوە، بەم شێوەیە بەرەو گۆرەپانی مەحشەر ئەبردرێن ﴿عن عائشة رضي الله عنها قال النبي ﷺ يُحْشَرُ النَّاسُ يومَ الْقِيامَةِ حُفاةً عُراةً غُرْلاً، قُلْتُ: يا رسُولَ اللهِ ﷺ. اَلنِّساءُ وَالرِّجالُ يَنظُرُ بَعْضُهُمْ الىٰ بَعضٍ؟ قالَ: يا عائِشَةَ اَلْاَمْرُ أشَدُّ مِنْ اَنْ يَنْظُرَ بَعْضُهُمْ الىٰ بَعضٍ﴾ رواه البخاري، ومسلم، پێغەمبەر ﷺ فەرموی: ئەم خەڵکە بە پێخواسیو، بەرووتیو، بەسوننەت نەکراوی، لە رۆژی قیامەت حەشر ئەکرێن، عائشە گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئایا ژن و پیاو تەماشای یەکتر ئەکەن؟ فەرموی: کار لەوە سەخت ترە کە تەماشای یەکتر بکەن.

﴿وعن بَهز بن حكيم رضي الله عنه قال النبي ﷺ انكُمْ مَحْشُورُونَ رجالاً وَرُكْباناً وَتجَرُّونَ عَلىٰ وُجوهِكُمْ﴾ رواه الترمذي، پێغەمبەر ﷺ فەرموی: ئێوە ئەبردرێنە گۆرەپانی مەحشەر هەندێک بە پیادە، هەندێک بەسواری، هەندێک لەسەر روو رائەکێشرێن، ئینجا لە گۆرەپانی مەحشەر رائەگیرێن. جابزانە: ئەم گۆرەپانەی مەحشەر زەمینێکی ترە جگە لەم زەمینە، خوای گەورە فەرمویەتی ﴿يَوْمَ تُبَدَّلُ ٱلْأَرْضُ غَيْرَ ٱلْأَرض﴾ ٤٨ (ابراهيم) لە رۆژی دوایی ئەم زەمینە، بەزەمینێکی تر ئەگۆردرێ، (وعن سهل قال النبي ﷺ يُحْشَرُ النَّاسُ عَلىٰ أرضٍ بَيْضاءَ عَفْراءَ﴾ رواه البخاري ومسلم پێغەمبەر ﷺ فەرموی: ئەم خەڵکە لەسەر زەمینێکی سپییات حەشر ئەکرێ.

﴿وَعَن الْمقداد رضي الله عنه قال النبي ﷺ: تُدْنَى الشَّمسُ يَوْمَ الْقِيامَةِ مِنَ الْخَلْقِ حَتّى تَكُونَ مِنْهُمْ كَمِقْدار مِيلٍ فَيَكُونُ النّاسُ عَلىٰ قَدَرِ أعْمالِهِمْ في الْعَرَقِ، فَمِنْهُمْ مَنْ يَكُونُ الىٰ كَعبَيْهِ، وَمِنهُمْ مَنْ يَكُونُ الىٰ رُكْبَتَيْهِ، وَمِنْهُمْ مَنْ يَكُونُ الىٰ حِقْوَيْهِ وَمِنْهُمْ مَنْ يُلْجِمُهُ الْعَرَقُ اِلْجاماً﴾ رواه مسلم، پێغەمبەر ﷺ فەرموی: لە مەیدانی مەحشەر (کەخەڵک وەستاوە) رۆژلێیان نزیک ئەکرێتەوە، بە قەد میلێک، جا ئەم خەڵکە لەبەر گەرماییو، پاڵەپەستە، ئارەقەی لێ ئەچکێتە خوارەوە، هەر کەس بە گوێرەی کردەوەکانی لە گۆمی ئارەقەدا نقوم ئەبێ. هەندێک تا گۆزینگ، هەندێک تا ئەژنۆی



www.iqra.ahlamontada.com

هەندێك تا پشتێندی، هەندێك تا دەم ولوتی ئارەقە لغاوی ئەكا. (ئاگاداری) لەم ڕۆژە سەختـەدا، خزمایەتی‌و، پلەی دونیا، سودی نیە، بەڵام: شەهیدی ڕێگەی خوداو. چەند كەسێكی تر، كەلە حەدیس دا باسیان كراوە؛ لەم گەرمایی‌و، ترسە ئەپارێزرێن. ئینجا تا خوا حەز ئەكا ئەم خەڵكە لەو گۆرەپانە، بەو شێوەیە ڕائەگیرێ.

ئینجا بزانە: مرۆڤ لە دونیادا شوێنكەوتوی كام یاساو، كام سەركردە بوو بێ؛ لەمەیدانی مەحشەریش، هەر شوێن ئەم سەركردەیە ئەكەوێ و، لە ژێر ئاڵای ئەودا حەشری ئەكرێ، خوای گەورە فەرمـویـەتی ﴿يَوْمَ نَدعُوكُلَّ أُناسٍ بإمامِهِمْ﴾ ٧١ (الاسراء) لە ڕۆژی قیامەت هەموو خەڵكێك لەگەڵ پێشەوای خۆیانا بانگ ئەكەین، جا چاك بێ، یان خراپ بێ، ﴿عن عبدالله رضي الله عنه قال النبي ﷺ اَلْمَرأُ مَعَ مَنْ أَحَبَّ﴾ رواه البخـاری ومسلم. پێغـەمبـەر ﷺ فەرموی: لە ڕۆژی قیامەت، مرۆڤ لەگەڵ خۆشەویستەكەی خۆی دا حەشری ئەكرێ.

كەوابوو: ئەی موسوڵمان: هەر ئێستا بزانە: كێ پێشەواتە؟ شوێنكەوتوی كام كۆمەڵی؟ ... دوایی گلەیی لەكەس مەكە..

## « باسی شەفاعەتی پێغەمبەر ﷺ »

## تكا كردنە گەورەكەی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ اَلشَّفاعَةُ اَلعُظْمیٰ

| | |
|---|---|
| ئینجا (محمد) ﷺ ڕەســولی نازدار | ئەپارێتەوە لە خوای كردگار |
| دەست بە پرسیارو، وەڵام دان ئەكرێ | چاكەو خراپە ئاشكرا ئەكرێ. |

ئینجا ئەم خەڵكە لە وەستانی مەیدانی مەحشەر بێزار ئەبن و، ڕێك ئەكەون و ئەچنە لای حەزرەتی (آدم) و (نوح) و (ابراهيم) و (موسى) و (عيسىٰ) عليهم الصلواة والسلام تاكو لە لای خوا تكایان بۆ بكەن و، دەست بە دادكردنی ئەم خەڵكە بكرێ، بەڵام ئەم پێغەمبەرانە هیچیان ناوێرن تكایان بۆ بكەن لە ترسی خودا، ئینجا ئەچنە لای گەورەی پێغەمبەران حەزرەتی (محمد ﴿ﷺ﴾)، ئەم گەورەو بەڕێزە، لەلای خوا تكایان بۆ ئەكاو، خوای گەورە تكای وەرئەگرێ و، دادگای مەحشەر دەست پێ ئەكا، بڕوانە (البخاری و مسلم).

جا بزانـە! ئەم تكا گەورەیە هەروەك پێی ئەگوترێ ﴿اَلشَّفاعَةُ الْعُظْمىٰ﴾ پێشی ئەگـوتـرێ (اَلمَقامُ اَلمَحْمُود) چونكە لەم تكایەدا جیاوازی لە نێوان ئوممەتی خۆی‌و خەڵكی تر ناكا، هەروەك خۆی فەرمویەتی (وهُوَ الْمَقامُ الْمَحْمُودُ الَّذي قَالَ اللهُ «عَسىٰ



www.iqra.ahlamontada.com

اَنْ يَبْعَثَكَ رَبُّكَ مَقاماً مَحْمُوداً» ٧٩ (الاسراء) رواه الترمذی، ئەو تکایە ئەو (اَلْمَقام الْمَحمودَ)یە کە خوا لە قورئان وەعدەی پێ داوم و، خەڵك سوپاسم ئەکا.

(ئاگاداری) پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ پێنج (شەفاعەتی) هەیە (١) ئەم تکا گەورەیەی باسمان کرد، (٢) تکاکردن بۆ دەرهێنانی موسوڵمانە گوناهبارەکان لە دۆزەخ (٣) تکا کردن بۆ هەندێك گوناهباران، کە هەر نەچنە دۆزەخ (٤) تکاکردن بۆ زێدەکردنی پلەی هەندێك کەس لە بەهەشت (٥) تکاکردن بۆ هەندێك لە موسڵمانان تاکو بەبێ دا .. ردن بچنە بەهەشت.

## «ڕوون کردنەوەی شەفاعەتی پێغەمبەران و، پیاو چاکان»

خوای گەورە فەرمویەتی (يَوْمَئِذٍ لا تَنْفَعُ الشَّفاعَةِ اَلا مَنْ أذِنَ له الَّرحْمنُ و رَضِيَ لَهُ قَوْلاً) ١٠٩ (طه) واتە لە ڕۆژی قیامەت، تکاکردن بۆ هیچ کەس سودی نیە، تەنها بۆ ئەو کەسە سودی هەیە، کە خوا ئیزن بدا تکای بۆ بکرێ‌و، شادەی هێنابێ، ئینجا کە خوای گەورە ئیزنی‌دا، ئەم جۆرە کەسانە شەفاعەت ئەکەن.

(عن عثمان رضي الله عنه:قال النبي ﴿ﷺ﴾ يَشْفَعُ يَوْمَ الْقِيامَةِ ثَلاثَةٌ: اَلْاَنْبِياءُ، ثُمَّ الْعُلَماءُ، ثُمَّ الشُهَداءُ) رواه ابن ماجه، لە ڕۆژی قیامەت سێ چین شەفاعەت ئەکەن یەکەمجار پێغەمبەران صلی الله علیهم أجمعین، ئینجا زانایانی ئایینی، ئینجا شەهیدانی ڕێگەی خودا، کەواتە:شەهید بە تەنها تکا بۆ حەفتا کەس لە خزم و کەسی خۆی ئەکا بروانە (الترمذي). هەروەها جگە لەم سێ چینەش پیاو چاکانی تر شەفاعەت ئەکەن (عن ابي سعيد رضي الله عنه:قال النبي ﴿ﷺ﴾ اِنَّ مِنْ أُمَّتي مَنْ يَشْفَعُ لِلْفِئامِ، وَمِنْهُمْ مَنْ يَشْفَعُ لِلْقَبِيلَةِ، وَمِنْهُمْ مَنْ يَشْفَعُ لِلْعُصْبَةِ، وَمِنْهُمْ مَنْ يَشْفَعُ لِلرَّجُلِ حَتَى يَدْخُلُوا الْجَنَّةَ) رواه الترمذي. لە ئوممەتی من مرۆڤی وا هەیە، تکا بۆ کۆمەڵێکی گەورە ئەکا، هەیە تکا بۆ هۆزێك ئەکا، هەیە تکا بۆ کۆمەڵێکی بچوك ئەکا. هەیە تکا بۆ یەك پیاو ئەکا، تاکو بچنە بەهەشت.

## (باسی پرسیارو، وەڵامی ڕۆژی قیامەت) (اَلْحِساب)

ئەو شتەی کردوتە لەم دونیایەدا
چاکەو، خراپەو، ئەو ماڵەی هەیە
لەسەر کردەوەت دەست و زوبانت

دەربارەی خەڵك، یانە هی خودا
چۆنت رابواردوە؟ پرسیاری هەیە
گشتی شاهیدە، هەم قاچەکانت

خوای گەورە فەرمویەتی (فَلَنَسْأَلَنَّ الَّذينَ اُرْسِلَ اِلَيْهِمْ وَلَنَسْئَلَنَّ الْمُرْسَلِينَ) ٦ (الاعراف): واتە: ئێمە پرسیار لەو کەسانە ئەکەین کە پێغەمبەرمان بۆ ناردون،



www.iqra.ahlamontada.com

وەپرسیار لە پێغەمبەرەکانیش ئەکەین (وعن ابي برزة رضي الله عنه:قال النبي ﴿ﷺ﴾ لا تَزُولُ قَدما عَبْدٍ حَتّى يُسْأَلَ عَنْ عُمُرِه فيمَ أفْناهُ، وَعَنْ عَملِه فِيمَ فَعَلَ، وَعَنْ مالِه مِنْ أينَ اكْتَسَبَهُ وَفيمَ أنْفَقَهُ، وَعَنْ جِسْمِهِ فِيمَ أبْلاهُ) رواه الترمذي، قاچەکانی مرۆڤ لە شوێن خۆی لا ناچێ، تا پرسیاری لێ ئەکرێ: تەمەنی چۆن بردۆتە سەر؟ کردەوەی بۆ چی کردوە؟ ماڵی خۆی لە کوێ وە دەست هێناوە؟ لەچی سەرف کردوە؟ لاشەکەی خۆی لەچی بەکار هێناوە؟ جا هەر کەسێ وەڵامی راست نەداتەوەو، دان نەهێنی بە کردەوەکانی، گشت ئەندامەکانی شاهیدی لەسەر ئەدەن، خوای گەورە فەرمویەتی: (يَوْمَ تَشْهَدُ عَلَيْهِمْ اَلْسِنَتُهُمْ وَاَيديهِمْ وَارجُلُهُمْ بِما كانُوا يَعْمَلُونَ) ٢٤ (النور) واتە لە رۆژی قیامەت، شاهیدی لەسەر خەڵك ئەدەن، زوبانیان و، دەستەکانیان و، قاچەکانیان، بەوەی کردویانە.

## (باسی دەفتەری کردەوەکان = صُحُفُ الأَعْمال)

کردارو، گوفتار لەم دونیایەدا
گشتی نوسراوە، چویتە لای خودا
خۆشی بۆ کەسێ کە بە دەستی راست
وەرئەگری نوسراو، ئەچێتە جەننات
گەر بەدەستی چەپ وەربگری نوسراو
بۆ جەهەننەمە شوێنی دیار کراو

خوای گەورە فەرمویەتی ﴿وَاِنَّ عَلَيْكُمْ لَحافِظِينَ كِراماً كاتِبِينَ﴾ ١٠ (الانفطار) چەند فریشتەیەك لەسەر ئێوە چاودێرن و، کردەوەکانتان ئەنوسن و، بەرێزن. ئینجا هەموو کەس لە رۆژی قیامەت ئەم نوسراوانە وەرئەگرێتەوەو، خوای گەورە پێی ئەفەرموێ ﴿اِقْرَأْ كِتابَكَ﴾ ١٤ (الاسراء) دەفتەری کردەوەکانت بخوێنەوە، جا ئەم خەڵکە لەوەرگرتنەوەی دەفتەرکانیان دووجۆرن، هەروەك خوای گەورە فەرمویەتی ﴿فَاَمّا مَنْ اُوتِيَ كِتابَهُ بِيَمِينِه فَسَوْفَ يُحاسَبُ حِساباً يَسيراً وَيَنْقَلِبُ اِلى أهْلِه مَسْرُوراً، وَاَمّا مَن اُوتِيَ كِتابَهُ وَراءَ ظَهْرِه فَسَوْفَ يَدْعُو ثُبُوراً ويَصْلى سَعيراً﴾ ٧ ـ ١٠ (الانشقاق) واتە هەرکەسێ دەفتەری کردەوەکانی بەدەستی راستە بدرێتەوە،ئەمە دادکردنێکی کەمی ئەکرێ‌و، بەدڵخۆشی ئەچێتە بەهەشت. بەڵام هەرکەس لەلای پشتەوە بەدەستی چەپە دەفتەرەکەی بدرێتەوەهەئەوە هاواری قور بەسەری ئەکاو، ئەچێتە دۆزەخ، جا بزانە: ئەم خەڵکە سێ‌جار لە خزمەت خوا رائەگیرێن دووجار هەرکێشەو عوزر هێنانەوەیە، ئینجا دەفتەری کردەوە ئەدرێتەوە دەست خاوەنەکانیان بروانە (الترمذی).



www.iqra.ahlamontada.com

## (باسی تەرازوی ڕۆژی قیامەت = المیزان)

چاکەو خراپە گشتی نوسراوە، تەرازوی راستی لە بۆ داندراوە
هەر کەسێ چاکەی گرانتر دەرکەوێ جێگەی بەهەشتە رازی یە لەوێ
بەلام ئەو کەسەی چاکەی سوکترە ئەو قوڕبەسەرەو جێگەی ئاگرە

بزانە: کە پرسیارو، وەلام کۆتایی هات و، هەر کەسەش دەفتەری کردەوەی وەرگرت ئەچێتە لای تەرازو، تاکو بزانی چاکەی گرانترە؟ یان خراپە؟ خوای گەورە فەرمویەتی ﴿وَنَضَعُ الْمَوازِينَ الْقِسْطَ لِيَوْمِ الْقِيامَةِ، فَلا تُظْلَمُ نَفْسٌ شَيْئاً، وَإِنْ كانَ مِثْقالَ حَبَّةٍ مِنْ خَرْدَلٍ أَتَيْنا بِها وَكَفى بِنا حاسِبِينَ﴾ ٤٧ (الانبياء) واتە: تەرازوی داد پەروەری بۆ ڕۆژی قیامەت دائەنێین، کەوابوو: هیچ کەسێك ستەمی لێ ناکرێ، ئەگەر بە ئەندازەی دەنکە گلێرەیەك چاکە، یان خراپەی هەبێ، ئەیهێنینە ناو تەرازو، ئێمە بەتەنها بەروەستی سەر ژمێرکردنی کردەوەکان ئەکەین.

جا بزانە: لەحەدیسی پێغەمبەر ﷺ وادەر ئەکەوێ، کە ئەم تەرازووە، وەکو تەرازوی دونیا، دووڵای هەیەو، نوسراوی کردەوەکانی پێ ئەکێشرێ، ﴿عن عبدالله بن عَمْرو رضي الله عنهما في حَديثِ الْبطاقَةِ الطَّويل: فَتُوضَعُ السِّجلاتُ في كَفَّةٍ وَالْبِطاقَةُ في كَفَّةٍ﴾ رواه احمد والترمذي، واتە: پسولەکەی ﴿لا اله الا الله﴾ لەلایەکی تەرازو دائەندرێو، دەفتەرەکانی خراپەش لەلایەکی تر. خوای گەورە فەرمویەتی ﴿فَأَمَّا مَنْ ثَقُلَتْ مَوازِينُهُ فَهُوَ في عِيشَةٍ راضِيَةٍ، وَأَمّا مَنْ خَفَّتْ مَوازِينُهُ فَأُمُّهُ هاوِيَةٌ﴾ ٦ ـ ٨ (القارعة) هەر کەسێ لاتەرازوی چاکەی گرانتربێ. ئەکەوێتە ژیانێکی خۆش، وە هەر کەسێ چاکەی لە خراپە سوکتربێ. جێی دۆزەخە.

جا بزانە: ئەو کەسانەی چاکەو خراپەیان بەیەك ئەندازەیە: ئەوان تاماوەیەك لە (أعراف) ئەمێننەوە (شوێنێکە لە نێوان بەهەشت و، دۆزەخ) بڕوانە تەفسیری ئایەتی ﴿وَعَلَى الأَعْرافِ رِجالٌ﴾ ٤٦ (الأعراف).

## (باسی تۆڵە وەرگرتنی ڕۆژی قیامەت = القِصاص)

هەر کەسێ ماڧ خەلکی لە سەر بێ وەکو کوشتن و. دزی کردبێ
یا جنێوی پێ بداو، ناموسی ببا یانە زۆر داربێو. زیانی لێ بدا
جگە لەمانەش، خودای کردگار تۆڵە وەر ئەگرێ لە چاکەی زۆردار
ئەیداتە ئەوەی زۆری کراوە کەر چاکەی نەماو. داوا کارماوە
ئەوە لە جیاتی خراپەی هەموویان ئەیبە ئە دۆزەخ هیچ نیە گومان



www.iqra.ahlamontada.com

﴿عن ابي هريرة رضي الله عنه:قال النبي ﴿ﷺ﴾ مَنْ كَانَتْ عِنْدَهُ مَظْلَمَةٌ لأخيه، فَلْيَتحلّلْهُ مِنْهَا، فَإِنَّهُ لَيسِ ثَمَّ دِينارٌ وَلاَدِرْهَمٌ، مِنْ قَبْلِ اَنْ يُؤخَذَ لأخيه من حَسَنَاتِهِ، فَإِنْ لَمْ يَكُنْ لَهُ حَسَنَاتٌ، اُخِذَ مِنْ سَيِّئَاتِ أخيه فَطُرِحَتْ عَلَيْهِ﴾ رواه البخاري ومسلم،
هەر کەسێك مافی ستەمێکی برای خۆی لەلایە، با لە دونیا ئەو مافە بداتەوە، چونکە لەرۆژی دوایی‌دا دینار و دیرهەم نیە لە تۆڵەبدا، کەوابوو:لەوێ چاکەکانی زۆردار لەتۆڵە وەرئەگیرێ، ئینجا ئەگەر چاکەی نەبوو، یان بەر وەستی تۆڵەی نەکرد، ئەوە خراپەی ستەم لێکراوەکە ئەخرێتە سەر خراپەکانی زۆردارەکەو، بەخراپەی هەردووکیان لە دۆزەخ سزا ئەدرێ. (بزانە) ئەو مافە: خوێن بێ، یان ناموس بێ، یان ماڵ بێ، یان ئازار دان بێ؛ گشتی لەرۆژی قیامەت تۆڵەی وەرئەگیرێ. کەوابوو: بەزوترین کات لەدونیا. خاوەنی ئەم مافانە رازی بکەو گەردەنی خۆت پێیان ئازاد بکە.

## (باسی حەوزی کەوسەر (اَلْكَوْثَرْ)

**پێش بچیە بەهەشت ئەی برای موسوڵمان لەلای پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ تۆ ئەبیە میوان**
**لە حەوزی کەوسەر ئاو ئەخۆیەوە هێندە شیرینە، تینو نابیەوە**

ئینجا کە دادگای مەحشەر کۆتایی هات، موسوڵمانان ئەچنە سەرحەوزی پێغەمبەر ﷺ لەو حەوزە ئاو ئەخۆنەوە، ئاوی ئەو حەوزە لە روباری ﴿اَلْكَوْثَرْ﴾ پر ئەکرێ‌و، سەرچاوەی رووبارەکەش لەبەهەشتە، (عن انس رضي الله عنه‌قال النبي ﷺ : أُنْزِلَتْ عَلَيَّ سُورَةٌ آنِفاً فَقرَأَ ﴿بسم الله الرحمن الرحيم اِنَّا اَعْطَيْنَاكَ اَلْكَوْثَرِ﴾ حَتَّى خَتَمهاَ، ثُمَّ قَالَ هَلْ تَدْرُونَ مَا اَلْكَوْثَرُ؟ قالوا: الله وَرَسُولُهُ اَعْلَمُ، قَالَ: فَانَّهُ نَهْرٌ وَعَدَنِيه رَبِّي عَزوجل فِي اَلْجَنَّةِ، وَعلَيْهِ خَيْرٌ كَثِيرٌ، عَلَيْهِ حَوْضٌ تَرِدُ عَلَيْهِ أُمَّتِي يَوْمَ اَلقِيَامَةِ، آنِيَتُهُ عَدَدُ اَلكَوَاكِبِ﴾ رواه أحمد وابو داود. پێغەمبەر ﷺ فەرموی: ئێستا سورەتێکم بۆ هاتە خوارەوە، ئینجا سورەتی (الكوثر)ی بەتەواوی خوێندەوەو، فەرموی: ئەزانن (اَلْكَوْثَر) چی‌یە؟ گوتیان: خواو، پێغەمبەر ﷺ ئەزانن فەرموی (کەوسەر) روبارێکە لەبەهەشت، خوا وەعدەی پێ‌داوم، ئەم روبارە ئەرژێتە حەوزێك، ئوممەتی من لە رۆژی قیامەت دێنە سەر ئەو حەوزە ئاو ئەخۆنەوە، جامەکانی بەقەد ئەستێرەی ئاسمانە.
**(ئاگاداری)** هەر کەسی لە رێبازی پێغەمبەر ﷺ لایدابێ. ناگاتە سەر ئەو حەوزەو ئاوی لێ ناخواتەوە، ئینجا بزانە: رای بەهێزتری زانایان ئەمەیە: کە حەوزی کەوسەر لە گۆرەپانی مەحشەرە، بەڵام رای دووەمین ئەفەرموێ: لەدوای تێپەربوونی پردی جەهەننەمە. جا بەهەر جۆرێك بێ: ئاوی ئەو حەوزە لە هەنگوین شیرین ترەو، هەر کەسێك لێ‌ی بخواتەوە جارێکی تر تینو نابیتەوە بروانە (البخاري و مسلم).


www.iqra.ahlamontada.com

## باس پردی جەهەننەم - الصراط

ئینجا کە مەحشەر کۆتایی پێ دێ — لەسەرجەهەننەم پردێک دائەندرێ
ئەبێ هەموو کەس پێیدا تێپەرێ — وەك بروسك و، وەك با، هەندێکیش ئەفرێ
هەندێکیش لەوێوا ئەکەونە خوار — بۆ ناو جەهەننەم، ئەکەنە هاوار

خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا فەرمویەتی (وَاِنْ مِنْكُمْ اِلَّا وَارِدُهَا كَانَ عَلَى رَبِكَ حَتْمًا مَقْضِيًّا ثُمَّ نُنَجِّي الَّذِينَ اتَّقَوْا، وَنَذَرُ الظَّالِمِينَ فِيهَا جِثِيًّا) ٧١ـ٧٢ (مريم) واتە: هیچ یەکێکتان هەبێ، ئەبێ بە جەهەننەم دا تێپەرێ، ئەم تێپەر بوونە خوا واجبی کردووە و براودتەوە، ئینجا ئەوانەی لە خوا ترسا بوون، رزگاریان ئەکەین و، ستەمکاردکانیش لە جەهەنـنـەم دا ئەهێڵینـەوە، ( عن ابي سعيد الخدري رضي الله عنه في حديثه الطويل، قال النبي ﴿ﷺ﴾: ثُمَّ يُضْرَبُ الْجِسْرُ عَلَى جَهَنَّمَ وَ تَحِلُّ الشَّفَاعَةُ فَيَقُولُونَ اللَّهُمَّ سَلِّمْ، سَلِّمْ،قِيلَ:يَا رَسُولَ الله ﴿ﷺ﴾ وَمَا الْجِسْرُ؟ قَالَ دَحْضٌ مَزَلَّةٌ. فِيهِ خَطَاطِيفُ و كَلَالِيبُ، فَيَمُرَّ الْمُؤْمِنُونَ كَطَرف الْعَيْنِ، وَكَالْبَرْقِ،وَكَالرِّيحِ وَكَالطَّيْرِ، وَكَاَجَاوِيدِ الْخَيْلِ وَالركَابِ، فَنَاجٍ مُسَلَّمٌ، وَمَخْدُوشٌ مُرْسَلٌ، وَمَكْدُوسٌ فِي نارِ جَهَنَّمَ)رواه البخاري، ومسلم.له حەدیسێکی درێژدا پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ ئەفەرموێ: ئینجـا پرد لە سەر دۆزەخ دا ئەندرێ و، کاتی شەفاعەت دێو، موسوڵمانان ئەڵێن خوایە سەلامەت بکە، سەلامەت بکە، گوتیان:ئەی پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ ئەم پردە چی‌یە؟ فەرموی: شتێکی لوسە، قاچ لێی ئەزەلی، لەم لاو، لە ولا قولابی پێوەیە، خاوەن باوەڕان بەسـەری دا تێئەپەڕن، هەندێك وەك چاو چوقانێك ـ وەك بروسك ـ وەك ـ با ـ وەك باڵندە ـ وەك ئەسپی چاك، ئینجا ئێ وەها هەیە بە سەلامەتی رزگار ئەبێ، هەیە ئەم قولابانە ئەیگرن و بریندار ئەکەن و بەرەڵلا ئەبێو، ئەپەڕێتەوە، هەیە لە سەر پردەکەوە هەڵئەدرێتە خوارەوە بۆ ناو دۆزەخ.

## « باسی دۆزەخ - جَهَنَّم »

قوولی جەهەننەم حەفتا ساڵ رێیە — گشتی ئاگرە، حەوت شوێنی لێیە
لە بۆ هەر شـوێنێ هەندێك تاوانبار — ئامادەی کردوە، خودای کردگار
هەرکەس بەگوێرەی گوناهی ئەسوتێ — کەسزای وەرگرت رزگاری ئەبێ
بەڵام ئـەو کەسـەی بە کافری بمرێ — ئەو یەکجاری‌یەو، رزگاری نابێ



www.iqra.ahlamontada.com

جەهەننەم = دۆزەخ، ئەو ئاگرەیەکە خوای گەورە ئامادەی کردوە، بۆ کافرەکان و موسـولمانانی تاوانبار ـ خوای گەورە فەرمویەتی (وَاِنَّ جَهَنَّم لَمَوْعِدُهُمْ اَجْمَعِينَ لَهَا سَبْعَةُ اَبْوابٍ لِكلِّ بابٍ مِنْهُمْ جُزْءٌ مَقْسُومٌ) ٤٣ـ٤٤ (الحجر) بێگومان دۆزەخ، شوێنی ئامادە کراوو وەعدە دراوی تاوانبارانە بە گشتی، ئەم دۆزەخە حەوت دەرگەی هەیە، واتە: حەوت نهۆمە، هەر دەرگەیەك بەشە تاوانبارێکی بۆ تەرخان کراوە، ئەمەش ناوی حەوت نهۆمەکەی دۆزەخە: جَهَنَّم، لَظَى، اَلْحُطَمة، السَّعير، سَقَر، اَلْجَحيم، هاوِيَة، زانایان فەرمویانە: (جَهَنَّم) نهۆمی سەرەوەیە بۆ موسولمانانی تاوانبارە.

**(ئاگاداری)** شوێنی دۆزەخ دیار نەکراوە، پلەی گەرمی و، قوولایی بەم شێوەیە: (عن ابي هريرة رضي الله عنه: قال النبي ﴿ﷺ﴾ نارُكُمْ هذهِ الَّتي يُوقِدُ ابْنُ آدَمَ جُزْءٌ مِنْ سَبْعينَ جُزْءً مِنْ حَرِّ جَهَنم) رواه البخاري ومسلم. پلەی گەرمی ئەم ئاگرەی ئێوە کە ئادەمیزاد دا یئەگیرسێنێ بەشێکە لە حەفتا پلەی گەرمی دۆزەخ، واتە: گەرمی دۆزەخ بە شەست و نۆ پلە زیاترە (وعن ابي هريرة رضي الله عنه: سَمِعَ النبي ﴿ﷺ﴾ وَجْبَةً، فَقال: هَذا حَجَرٌ رُمِيَ بِهِ فِي النَّار مُنْذُ سَبْعينَ خَريفاً) رواه مسلم، پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ گوێی لە دەنگێـك بوو، فەرموی: ئەمە بەردێکە فڕێ دراوەتە دۆزەخ، حەفتا ساڵ لەمەو پێش.

جا بزانە: هەر کەس بە کافری بمرێ بە یەکجاری لە دۆزەخدا ئەمێنێتەوەو رزگاری نابێ، خوای گەورە فەرمویەتی (اِنَّ الَّذينَ كَفَرُوا مِنْ اَهلِ الْكِتابِ وَالْمُشْرِكينَ في نارِ جَهَنَّمَ خالِدينَ فيها أولائِكَ هُمْ شَرُّ الْبَرِيَّةِ) ٧ (البينة) بێگومان: کافرەکان، لە جو، لە دیان، لە هاوبەش دانەرەکان بۆ خوا: گشتیان لە دۆزەخ دان و، هەتا هەتایە تێیدا ئەمێننەوە، ئەوانە خرا پترینی خەڵکن. بەڵام: موسوڵمانە تاوانبارەکان هەر کەسە بە گوێرەی گوناهەکانی ئەسوتێ و، کە سزای خۆی تەواو بوو: رزگار ئەبێ و، ئەچێتە بەهەشت (عن انس رضي الله عنه: قال النبي ﴿ﷺ﴾ يَخْرُجُ مِنَ النَّارِ مَنْ قالَ: لا اِلهَ اِلاّ اللّهُ وَفي قَلْبِهِ وَزْنُ ذَرَّةٍ مِنْ ايمانٍ) رواه البخـاری ومسلم. پێغـەمبەر ﴿ﷺ﴾ فەرموی: هەر کەسێك شادەی هێنابێ و بەقەد زەررەیەك باوەڕی لەناو دڵدا بێ: لە ئاگری دۆزەخ دەر ئەچێ و، رزگار ئەبێ، هەروەها زۆر کەسیش بە هۆی شەفاعەت رزگار ئەبێ، هەروەك باسمان کرد.



www.iqra.ahlamontada.com

## « باسی بەهەشت »

بەهەشت شوێنێکە لە ژوور حەوت ئاسمان — تایبەت داندراوە بۆ ئیمانداران
شوێنێکی وایە چی دڵ بیەوێ — یان چاو حەز بکا، داندراوە لەوێ
نەسەرمای زستان، نە گەرمای هاوین — نەستەمی زۆردار، هیچیان لەوێ نین
ناخۆشی‌و، قین و مردن نامێنێ — کەس دەرت ناکاو لەوێ ئەمێنێ
لە باغی بەهەشت لە ژێر درەختان — رووبارو، جۆگە دەروا زۆر ئاسان
باسی بەهەشتێ قەت تەواو نابێ — وا باش ئەزانم کەوا کۆتابێ

بەهەشت سەد پلەیە، لە سەرەوەی هەر حەوت ئاسمانەکانەو، لە خوارەوەی عەرشی خودایە، خوای گەورە فەرمویەتی (عِنْدَهَا جَنَّةُ الْمَأْوىٰ) ١٥ (النجم) بەهەشت لەلای (سِدْرَةُ الْمُنْتَهىٰ)یە (عن عُبادة، وابي هريرة رضي الله عنهما قال النَّبِي: فِي الْجَنَّةِ مِأَةُ دَرَجَةٍ ما بَيْنَ كُلِّ دَرَجَتَيْنِ كَما بَيْنَ السَّماءِ وَالأَرْضِ، وَالْفِرْدَوْسُ أَعْلاها دَرَجَةً، وَمِنْها تَفَجَّرُ أَنْهارُ الْجَنَّةِ الأَرْبَعَةُ، وَمِن فَوْقِها يَكونُ الْعَرْشُ) رواه البخاري والترمذي، پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ فەرموی: لە بەهەشت دا سەد پلە هەیە، نێوانی هەر پلەیەك وەکو نێوان ئاسمان و زەمینە، (فیردەوس) لە هەموو پلەکان بەسەرەوە ترە، هەر لەو (فیردەوسە)وە، چوار روبارەکانی بەهەشت هەڵئەقوڵێن، جا لە سەرەوەی (فیردەوس) عەرشی خودایە، واتە: عەرشی خوا بانی بەهەشتە.

ئینجا بزانە: باسی بەهەشت لەم نامیلکەیەدا نایەتە نوسین، چونکە هەشت بەشی هەیە، ئەم هەشت بەشە سەد پلەیە، ئینجا باسی چوار روبارەکەی بەهەشت و باسی حۆری‌و، باسی خواردن و، جل و بەرگی بەهەشت، لە قورئان و، حەدیس بخوێنەوە.

## « دیتنی خوای گەورە لە بەهەشت و گۆڕەپانی مەحشەر »

خوای گەورە فەرمویەتی (وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ ناضِرَةٌ إلىٰ رَبِّها ناظِرَةٌ) ٢٣ (القيامة) لە رۆژی قیامەت چەند روخسارێك ئەدرەوشێنەوەو، تەماشای خوای خۆیان ئەکەن (عن جرير بن عبدالله رضي الله عنه قال: نَظَرَ النَّبِيُّ ﴿ﷺ﴾ إلىٰ الْقَمَرِ لَيْلَةَ الْبَدْرِ فَقالَ: إنَّكُمْ سَتُعْرَضُونَ عَلىٰ رَبِّكُمْ فَتَرَوْنَهُ كَما تَرَوْنَ هٰذا الْقَمَرَ لا تُضامُونَ فِي رُؤْيَتِهِ)
رواه البخاری ومسلم. پێغەمبەر ﷺ لەشەوی چواردە، تەماشای مانگی کردو، فەرموی: ئێوە ئەبردرێنە خزمەت خوای گەورە، بە چاوی خۆتان خوا ئەبینن، هەروەکو ئەم مانگە ئەبینن، هەر گومانتان لە دیتنی نابێ.

بەڵام: کافرەکان خوا نابینن خوای گەورە فەرمویەتی ﴿كَلَّا إنَّهُمْ عَنْ رَبِّهِمْ يَوْمَئِذٍ لَمَحْجُوبُونَ﴾ ١٥ (المطففون) کافرەکان لەرۆژی قیامەت قەدەغە ئەکرێن لە دیتنی خوا.



www.iqra.ahlamontada.com

## «باسی عەرش و، کورسی»

عەرش: شتێکە پێچکەی هەیەو، لە هەموو دروستکراوێك گەورەترەو، ئەکەوێتە سەرەوەی کورسیو، دەورەی لەکورسیو، ئاسمان و، زەمین داوەو، هەشت فریشتە هەڵیئەگرن خوای گەورە فەرمویەتی ﴿وَيَحْمِلُ عَرْشَ رَبِّكَ فَوْقَهُمْ يَوْمَئِذٍ ثَمَانِيَةٌ﴾ ١٧ (الحاقة) لە ڕۆژی قیامەت لەسەرەوەی فریشتەکان، هەشت فریشتە عەرشی خوا هەڵئەگرن (عن ابی ذر رضي الله عنه،قال النبي ﷺ:مَاالسَّموات السَّبْعُ ، وَالْأَرَضُونَ السَّبْعُ فِي جَنْبِ الكُرْسِيِّ الَّا كَحَلْقَةٍ مُلْقَاةٍ فِي فَلاةٍ، وَالكُرسِيُّ عِنْدَ الْعَرش كَذٰلِكَ﴾ آخرجه ابن جَرير، وابن مَرْدَوَيْه، پێغەمبەر ﷺ فەرموی: هەر حەوت ئاسمان و زەمینەکان بەرانبەر بەکورسی، وەکو ئالقەیەکی فرێدراو لە بیابانێك وایە، کورسیش لەبەرانبەر عەرشی خوا وەك ئەم ئالقەیە لە بیابانێك ـ ئیمام (عبد اللّطیف السُّبْکی) لە تەفسیری ﴿وَهُوَ رَبُّ الْعَرْشِ الْعَظِيمِ﴾ ١٢٩ (التوبة) فەرمویەتی (عەرش) مەڵبەندی کاروباری خوای گەورەیە، واتە: بارەگای زاتی خوا نیە، هەروەها قازی (بَیْضاوی) لە تەفسیری ئەم ئایەتەو، ئایەتی ﴿ثُمَّ اسْتَوىٰ عَلَى الْعَرْشِ﴾ ٥٤ (الاعراف) فەرمویەتی: بڕیارەکانی خوای گەورە لە عەرشەوە دێنە خوارەوە.

کورسی: شتێکە لە ئاسمانەکان و زەمینەکان گەورەترەو، لەسەرەوەی هەر حەوت ئاسمانەکانەو، لەبن عەرشی خودایە، خوای گەورە فەرمویەتی ﴿وَسِعَ كُرْسِيُّهُ السَّمَوَاتِ وَالْأَرْضَ﴾ (٢٢٥) (البقرة) واتە:کورسییەکەی خوا، بەرفراوانی ئاسمانەکان و، زمینە.

## ٦ ـ باسی قەزاو قەدەر (اَلْقَضاءُ وَالْقَدَرُ)

پێش بوونی (آدم) هەرچی ڕووی داوە — دوای بوونی ئەویش تا دونیا ماوە
ژیان و مردن و ساغی و ناخۆشی — بوونی و هەژاریو غەمناکی و خۆشی
هەمووی بەویست و زانستی خوایە — بەسەرهاتی تۆ، تەواو نوسرایە
بەڵام پێویستە هەر هەوڵ بدەی — لەبەر چارەنوس تەمبەڵی نەکەی
بە گوێرەی توانات بچێژە زەحمەت — تا سەرکەوتو بی لە دونیا و قیامەت.

(قەزاو ، قەدەر) واتە: بڕیاردانی خوا بەویستی خۆی، بوون، یان نەبونی شتێك، بە ئەندازەیەکی دیارکراو، لەکات و، شوێنێکی دیارکراو، هەروەك خۆی فەرمویەتی ﴿إِنَّا كُلَّ شَيْءٍ خَلَقْنَاهُ بِقَدَرٍ﴾ ٤٩ (القمر) ئێمە هەموو شتێکمان دروست کردوە، بە ئەندازەیەکی زاندراو. هەروەها فەرمویەتی ﴿وَكُلُّ شَيْءٍ عِنْدَهُ بِمِقْدَارٍ﴾ ٨ (الرعد) هەمو شتێك لەلای خوا بەئەندازەیە.



www.iqra.ahlamontada.com

جابـزانە. قەزاو قەدەر، روكنی شەشەمی ئیمانە، کەوابوو واجبە باوەڕمان هەبێ: هەرچی هەبوودو، هەرچی ئەبێ لەهەبوونیو، هەژاریو، ساغیو، نەخۆشیو، ژیان و، مردن و زانستیو، نەزانیو، گەورەییو، هتــد: گشتی بە ویست و، بریــار دان و، زانستی خودایە، ئەندازەو، کات و، شوێنی بۆ داناوەو، هیچ کەسیش ناتوانێ ئەم بریارو، ئەندازەیە بگۆڕێ.

(عن جابر رضي الله عنه:قيل،يا رسول الله ﷺ فِيمَ الْعَمَلُ الْيَوْمَ؟ أفيما جفَّت به الأقْلامُ، وَجرَت به الْمقاديرُ، ام فيما نَستَقبلُ؟ قالَ: لا، بَلْ فيما جفَّتْ به الأقْلامُ، وَجرَتْ به الْمقاديرُ، قال: فَفيمَ الْعَمَلُ؟ قالَ: كُلُّ عامِلٍ مُيَسَّرٌ لِعَمَلِه﴾ رواه مسلم: پرسیار لە پێغەمبەر کرا ﷺ ئایا ئەو کردەوانەی ئێستا ئەیکەین، لەمەوپێش نوسراوەو، ئەندازەی بۆ دانراوە، یان کە کردمان ئینجا ئەنوسرێ؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بەڵکو لەمەوپێش نوسراوەو نوسراوەکەش وشــك بووەتــەوەو، ئەندازەش داندراوە، گوتیان: کەوابێ، کردەوەمان بۆچییە؟ فەرمووی: هەموو کەسێك بۆ کردەوەی خۆی رێگەی بۆ ئاسان ئەکرێ، جا چاکە بێ، یان خراپە.

## « دەسەڵاتی بەندە لە کردەوەکانی »

خوای گەورە فەرمــویەتی ﴿وَاللهُ خَلَقَكُمْ وَما تَعْمَلُونَ﴾ ٩٦ (الصافات) واتە: خوا ئێوەو کردەوەکانی ئێوەی دروست کردوە. (ئەی موسوڵمانی خۆشەویست) کە جەنابت تەماشای ئەم ئایەتەو، حەدیسەکەی رابوردو ئەکەی، پرسیارێك رووت تێ ئەکا: ئایا کە خودا کردەوەکــانی ئێمــەی دروست کردبێو، بریــارەکــەی خۆی لەم بابــەتەوە نوسرابێو، برابێتەوە ،بۆچی ئێمە، لەسەر چاکە پاداشمان ئەدرێتێو، لەسەر خراپە سزا ئەدرێین؟

وەڵام: هەر کارێك کەبکرێ، لەدوو رووەوە تەماشای ئەکرێ، یەکەم: (خَلْق) واتە: دروست کردن لە نەبوونەوە، دووەم (كَسْب) واتە: وەدەست هێنان پاش دروست کردن.

جا هەموو کارێك لەڕووی یەکەمەوە (خَلْق)ی خوایە، واتە: خوای گەورە لە نەبوونەوە دروستی کردوەو، لەم رووەوە بەندە هیچ پەیوەندی پێوەنیە، بەڵام: لە رووی دووەمەوە (كَسْب)ی بەنــدەیە، واتە: پاش دروست کردنی خوا، بەندە وەدەستی دێنێ. بەو هێزو توانایەی خوا داویەتیێ ، جا چاکە بێ، یان خراپە، خوای گەورە فەرمویەتی ﴿لَها ماكَسَبَتْ وَعَلَيْها مَا اكْتَسَبَتْ﴾ ٢٨٦ (البقرة) پاداشی وەدەست هێنانی چاکە بۆ خۆیەتی، وەسزای وەدەست هێنانی خراپە لەسەرخۆیەتی.



www.iqra.ahlamontada.com

ئینجا بزانە: هەروەك بەندە هێزو توانای وەدەست هێنانی چاکەو خراپەی دراوەتێ، هەروەهاش خوای گەورە بەندەی خۆی کردۆتە (سەر پشك)، بۆ کردن و نەکردن، بەم سەرپشکیە ئەگوترێ (اِخْتِیار) واتە سەربەخۆییو زۆر لێ نەکردن، جا لەبەرئەم سەربەخۆییە، ئەگەر توانای خۆت لەوەدەست هێنانی ئەو چاکەیە بەکارهێنا کە خوا دروستی ئەکا: ئەوە پاداشت ئەدرێتێ، وە ئەگەر بۆ وەدەست هێنانی ئەو خراپەیەت بەکارهێنا کە خوا دروستی ئەکا: ئەوە سزا ئەدرێی، جا دەربارەی ئەم سەربەخۆییە خوا ئەفەرموێ ﴿فَمَنْ شاءَ فَلْيُؤْمِنْ وَمَنْ شاءَ فَلْيَكْفُرْ إنّاَ أعْتَدْنا لِلظّالِمِينَ ناراً﴾ ٢٩ (الكهف) هەرکەس حەز ئەکا: با باوەربێنێ، هەرکەس حەز ئەکا: با کافربێ، ئێمە ئامادەمان کردوە بۆستەم کاران ئاگری دۆزەخ.

## « تەنها دوا کردەوەکانی پێش مردن چاویان لێ ئەکرێ »

(عن سهل رضي الله عنه:قال النبي ﴿ﷺ﴾ ان الْعَبْدَ لَيَعْمَلُ عَمَلَ اَهْلِ النَّارِ وَانَّه مِنْ اَهْلِ الْجَنةِ، وَيَعْمَلُ عَمَلَ اَهْلِ الْجَنَّةَ وَانَه مْن أهل النَّارِ، وَاِنَّما الْأعْمالُ بِالْخَواتيم) رواه البخاري، پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ ئەفەرموێ: بەندەی وا هەیە، کردەوەی دۆزەخیانە ئەکا، بەلاّم لە هەمان کاتیش دا بە بەهەشتی نوسراوە، هی وا هەیە کردەوەی - بەهەشتیانە ئەکا بەلاّم لە هەمان کاتیش دا بە دۆزەخی نوسراوە، لە کردەوەکان تەنها دوا کردەوەکانی پێش مردن بە بەرچاو ئەگیرێن.

رۆون کردنەوە: کە ئێمە ئەلێین: خوای گەورە هەموو شتێك ئەزانێو، هەرچی روو ئەدا نوسیویەتی: وا تێمەگە ئەم زانست و نوسینە ئەبێتە زۆر لێ کردن، بۆ وێنە کامێرەیەکی (ڤیدیو) لە سەربانەکەی خۆت بەرەو شەقام دابنێ، ئینجا تێلێکی ئە (ڤیدیو)یە بە (تەلەفزیونێك) ببەستەو، بەکاری بێخە، کاتێك لە ناو (تەلەفزیونەکەدا) ئەبینی، کۆمەڵێك بۆسەیان داناوە، تاکو کاك (ئازاد) بکوژن، هەروەها ئەبینی کاك (ئازاد) بەرەو بۆسەکە ئەروا، لێرەدا تۆ ئەزانی ئەم کۆمەڵە کاك (ئازاد) ئەکوژن، جا ئەگەر کوشتیان، ئەم زانستەی تۆ نەبووە زۆر لێکردن، نە بۆ کاك (ئازاد) و نە بۆ کومەڵەکە، کەواتە: خوا ئەزانی چ کارێك ئەکەی، بەلاّم زۆرت لێ ناکا.

(ئامۆژگاری) قەزاو قەدەر، نهێنییەکە لە نهێنییەکانی خوا.بە تەواوی پەردەی لەسەر لانەداوە،کەوابوو: باوەرت پێی هەبێ و، زۆر لێی مەکۆڵەوە.

## « باسی «لَوْح» و «قَلَم» »

(لوح المحفوظ) = (امّ الكتاب) لەوحێکە هەرچی روی داوەو، هەرچی روبدا، گشتی تێدا تۆمارکراوە، خوای گەورە فەرمویەتی (يَمْحُو اللَّهُ ما يَشاءُ وَيُثْبِتُ وَعِنْدَهُ اُمّ



www.iqra.ahlamontada.com

الْكِتاب) ٣٩ (الرعد) خوای گەورە چی حەز بکا، لای ئەباو ئەیسرێتەوە، چی حەز بکا دایئەنێ، (اُمُّ الْـكِتاب) واتە:(اللَّوْحُ الْمَحْفُوظ) لەلای خۆیەتی.

**بزانە**: هەمـوو کتێبـەکـانی خوا لە (اللوح المحفوظ)دا نوسراونەوە، خوای گەورە فەرمویەتی: (بَلْ هُوَ قُرْآنٌ مَجيدٌ في لَوْحٍ مَحْفُوظٍ) ٢١ (البروج) بەڵکو ئەو قورئانە بەرزو بەرێزە، لە لەوحێکی پارێزراو دایە.

(قلم) ئەو پێنوسەیە کە هەموو شتێ لە (اللوْح المحفوظ) دا نوسیوە (عن عبادة بن الصامت رضي الله عنه قال النبي ﴿ﷺ﴾ اَوّلَ ما خَلَقَ اللهُ الْقَلَمَ، فَقالَ: اُكْتُبْ، قالَ: ماذا اَكْتُبُ؟ قال: اُكْتُبِ الْقَدَرَ ما كانَ وما هُوَ كائِنٌ الى الأَبَدِ) رواه ابو داود و الترمذي. یەکەم شت کە خوا دروستی کردوە (قلم) بوو. پێی فەرموو: بنوسە، گوتی: چی بنوسم؟ فەرموی: ئەندازەی هەرچی بووەو هەرچی ئەبێ هەتا هەتایە.

## « باسی چاکە» - اَلإحْسانُ

چاکە ئەممیە ئەی برای موسوڵمان — تۆ بپەرستی خواوەندی (مَنّان)
هەروەك ببینی بە هەردوو چاوت — ئەگەر خواوەندیش نیتە بەر چاوت
باش بیپەرستە چونکە ئەتبینێ — شارەزای دڵتە، هیچ دانامێنێ

(عن عمر رضي الله عنه قال النبي ﴿ﷺ﴾ اَلْإحْسانُ اَنْ تَعْبُدَ اللهَ كَأَنَكَ تَراهُ، فَاِنْ لَمْ تَكُنْ تَراهُ فَاِنَّهُ يَراكَ) رواه مسلم. چاکە ئەوەیە تۆ خوا بپەرستی، وەك خوا لە بەر چاوت بێ و ببینی، جا ئەگـەر لە خوا پەرستی نەگـەیشتیە ئەم پلەیە، وەها بیپەرستە کە بێگومان خوا تۆ ئەبینی.

جا ئەگەر هاتوو بەندە بەم شێوەیە خوای پەرست ئەبێتە (مُتَّقی) واتە: لە خوا ترس، چونکـە لە خوا ترسان ئەوەیە: خوای گەورە لەو شوێنانە نەتبینی کە لێی قەدەغە کردوی، وە لەو شوێنانەت ون نەکا، کە فەرمانی پێکردوی، واتە چاکە لە دەست خۆت نەدەی و، خراپە نەکەی.

## « پێنج پەنهانەکان »

پێنج شت پەنهانە هەر خوا ئەیزانێ — دونیای وێران و، کام باران دێنێ
کۆرپەی لە ناو زگ دوا ڕۆژی چۆنە — کاری سبەینێ و، مەرگ چ شوێنە

پێنج شتی پەنهان هەیە، جگە لە خوای گەورە هیچ کەس نایانزانی، هەر پێنجیان لەم ئایەتە پیرۆزە دایە (اِنَّ اللهَ عِنْدَهُ عِلْمُ السَّاعَةِ، وَيُنَزِّلُ الْغَيْثَ وَيَعْلَمُ ما في الْاَرْحامِ، وَما تَدْري نَفْسٌ ماذا تَكْسِبُ غَداً، وَما تَدْري نَفْسٌ بِأَيِّ أَرْضٍ تَمُوتُ اِنَّ اللهَ عَلِيمٌ



www.iqra.ahlamontada.com

خبيرٌ ٣٤ (لقمان) زانستی كاتی دونیا وێران بوون لەلای خودایە، هەر خودا بارانی سود بەخش ئەبارێنی، وە خوا ئەزانی چی لەناو مندالّدانەكان دایە (واتە چاكی و خراپی و هەبوونی هتد)، وە هیچ كەس نازانی سبەینێ چی ئەكا، وە هیچ كەس نازانی لە كوێ ئەمرێ.

جا كە ئەم پێنج زانستییانە تایبەتی خوابێ، ئێمە باوەڕمان وایە فالّچییەكان و، هەوالّگۆیەكانی دوا رۆژ، گشتیان درۆزنن ﴿عن بعض امّهات المؤمنين رض الله عنها قال النبي ﷺ: مَنْ اَتىٰ عَرّافاً فَسَألَهُ عَنْ شَيْءٍ لَمْ تُقْبَلْ لَهُ صَلاةُ اَرْبَعِينَ لَيْلَةً﴾ رواه مسلم، وفي رواية الامام احمد: ﴿مَنْ اَتىٰ عَرّافاً أوْ كاهِناً فَصَدَّقَهُ بِما يَقُوْلُ فَقَدْ كَفَرَ بِما اُنْزِلَ عَلىٰ مُحَمَّدٍ ﷺ﴾ واتە: هەر كەسێك بچێتە لای فالّچییەك، پرسیاری شتێكی لێ بكا، نوێژی چل رۆژی لێ وەرناگیرێ، لە حەدیسێكی تردا، ئەفەرموێ: هەركەسێك بچێتە لای فالّچییەك، یان هەوالّگۆیەكی دوارۆژ، باوەڕیشی پێكرد، بەڕاستی ئەوە كوفری كردوە، بەو قورئانەی بۆ پێغەمبەر ﷺ هاتوتە خوارەوە

## « نیشانەكانی دونیا وێران بوون »

| | |
|---|---|
| دونیا وێران بوون نیشانەی هەیە | هەندێك بچوكەو هەندێك گەورەیە |
| دایك خزمەتچی كیژەكەی خۆی بێ | خانووی پێخواسان لە شارا دیار بێ |
| هەم ناكەس بەچە فەرمانڕەوا بێ | كوشتن زۆر ببێ و، ناموس هەرزان بێ |
| هاتنەوەی (عیسیٰ) لە گەورەكانە | دەججالی بەدخو فیتنەی زەمانە |
| گەڕانەوەی ڕۆژ لەلای رۆژئاوا | تۆبە نامێنێ و، دەرگەی داخراوە |

بزانە: دونیا وێران بوون، نیشانەی زۆری هەیە، لەو نیشانانە هەندێكیان گەورەنە، هەندێكیان بچوكن، جا بچوكەكان زۆرن، وەكو: ﴿عن انس رض الله عنه قال النبي ﷺ مِنْ أشْراطِ السّاعَةِ أنْ يُرْفَعَ الْعِلْمُ، وَيَظْهَرَ الْجَهْلُ، وَيَفْشُوَ الزِّنا وَتُشْرَبَ الْخَمْرُ وَيَكْثُرَ النِّساءُ وَيَقِلَّ الرِّجالُ حَتّىٰ يَكُوْنَ لِخَمْسِينَ اِمْرأةً قَيِّمٌ واحِدٌ﴾ رواه الترمذي پێغەمبەر ﷺ فەرموی: هەندێك لە نیشانەكانی دونیا وێران بوون، ئەمانەیە: زانستی ئایینی كەم ئەبێ و، نەزانی بلاو ئەبێتەوە، زینا زۆر ئەبێ، مەی ئەخورێتەوە بە ئاشكرا، ئافرەت زۆر ئەبن و، پیاو كەم ئەبن، تا بە پەنجا ئافرەت یەك پیاو بەڕێوەبەریان ئەبێت.

﴿وَعَن عمر رضي الله عنه في امـــــارات السّاعَة: قال النبي ﷺ: اَنْ تَلِدَ الْأمَةُ رَبَّتَها، وَاَنْ تَرىٰ الْحُفاةَ الْعُراةَ الْعالَةَ رِعاءَ الشاءِ يَتَطاوَلُوْنَ فِي الْبُنْيانِ﴾ رواه مسلم، نیشانەی دونیا وێران، بوون ئەمەیە:


www.iqra.ahlamontada.com

منالەکان بەسەر دایکیان دا فەرمان رەوابن و، دایك خزمەتکاری کیژەکەی خۆی بێ، وە رووت و، پێخواسەکان و، شوان مەرەکان شانازی و پێش برکێ بکەن بە بەرزی کۆشك و تەلارەکانیان، ﴿وعن حذيفة رضي الله عنهقال النبي ﷺ لاتَقُومُ السَّاعَةُ حَتّىٰ يَكُونَ أَسْعَدَ النّاسِ بالدُّنْيا لُكَعُ بْنُ لُكَعٍ﴾ رواه الترمذی، دونیا وێران نابێ، تا ناکەس بەچە لە هەموو کەس بەختەوەر تر ئەبێ، جگە لەمانەش نیشانەی تر زۆرن.

## (گەورەکان)

نیشانە گەورەکانی دونیا وێرانبوون لەم حەدیسەدا باسیان کراوە: (عن حُذيفة رضي الله عنه:قال النبی ﷺ في السّاعَة: انَّها لَنْ تَقُومَ حَتّىٰ تَرَوْا قَبْلَها عشر آيات: ....... فذكر:الدُّخانَ، وَالدَّجّالَ،وَالدّابَّةَ، وَطُلُوعَ الشَّمْسِ مِنْ مَغْرِبها، وَنُزُول عِيسَىٰ ابن مَرْيَم ﷺ وَيَأجوُج وَمَأجُوج، وَثلاثَةَ خُسُوفٍ: خَسفٌ بِالْمَشْرِق، وخَسْفٌ بِالْمَغْرِب وَخَسْفٌ بِجَزِيرَةِ الْعَرَبِ، وَآخِرُ ذٰلِكَ نارٌ تَخْرُجُ مِنَ الْيَمَنِ تَطْرُدُ النّاسَ إلىٰ مَحْشَرِهِم﴾ رواه مسلم، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: دونیا وێران نابێ، تا دە نیشانە ئەبینن پێش وێران بوون (١) دو کەڵێك دێ هەموو دنیا دائەگرێ تا ماوەی چل ڕۆژ (٢) هاتنی (دەججال) کە پیاوێکی کافرو، فێڵبازو، سیحربازە چاوی ڕاستەی کوێرەو، ئەڵێ من خوامە، ماوەی چل ڕۆژ لە زەمین ئەمینێتەوە جگە لە (مكة) و (مەدینە) ئەچێتە هەموو شوێنێك، ئینجا حەزرەتی (عیسی پێغەمبەر ﷺ) ئەیکوژێ (٣) هاتنی (دابَّةُ الْأَرْضِ) ئاژەڵی زەوی، جۆرە ئاژەڵێکە لە (مكة) دەر ئەکەوێ، دار عەسای (موسی) پێغەمبەرو، ئەنگوستیلەی (سُلَیمان) پێغەمبەری پێیە،علیهما الصلاة والسلام. موسوڵمان و، کافرەکان نیشان ئەکا (٤) گەڕانەوەی ڕۆژ لەلای ڕۆژئاوا (بزانە) بەهاتنی (دابَّةُ الأرْضُ) یان بە (گەڕانەوەی ڕۆژ) دەرگەی تۆبە دادێخرێو، کافریش ئیسلام بوونی لێ وەرناگیرێ (٥) هاتنە خوارەوەی حەزرەتی (عیسی) پێغەمبەر ﷺ ماوەی چل ساڵ ئەمینێتەوەو، بەشەریعەتی ئیسلام ڕەفتار ئەکا، هەرکە هاتە خوارەوە، دەججاڵ ئەکوژێ (٦) هاتنی (يَأجُوُجَ وَمَأْجُوج) ئەویش چینە خەڵکێکن دونیا داگیر ئەکەن و، برسییەتی بڵاو ئەبێتەوە، ئینجا حەزرەتی (عیسی) علیه الصلاة والسلام،دوعا ئەکا خوا لەناویان ئەبا (٧و٨و٩) سێ ڕوچون، یەك لە ڕۆژهەلات، یەك لە ڕۆژئاوا یەك لە دورگەی عەرەب (١٠) کۆتایی ئەم نیشانانە ئاگرێك لەلای (یَمَن) هەڵئەگیرسێ و، خەڵکی ڕاو ئەنێ، تا لە شوێنێك کۆیان ئەکاتەوە، جا بۆ زیاتر زانست دەربارەی ئەم نیشانانە، بگەڕێوە خزمەتی حەدیسەکانی پێغەمبەر ﷺ لە هەر کتێبێك حەز ئەکەی.

« کۆتایی »



www.iqra.ahlamontada.com

سوپاس بۆ خودا کە یارمەتی دام | بکەم بە هەڵبەست ئیمان و ئیسلام
سالی هەزارو چوارسەدو یازدە | مانگی رەمەزان لە رۆژی چواردە
(عبدالله)ی گوناهبار زۆر تکا ئەکا | هەر کەسێ خوێندی، دوعای بۆ بکا

(یاربّنا لك الحمد كما ينبغي لجلال وجهك ولعظيم سلطانك، لا أحصى ثناء عليك أنت كما أثنيت علىٰ نفسك) سوپاس بۆ تۆ ئەی خودای گەورەکە یارمەتیت دام هەڵبەستەکانی (ئیمان و ئیسلام) کە دانراوی خۆم بوو روشن بکەمەوە بە تیشکی قورئان و حەدیس، لە رۆژی شەممە (٧)ی (محرم) سالی (١٤١٤)ی کۆچی، ئەی خودای گەورەو بەهێز: لێت ئەپارێمەوە ئەم دانراوەم لێ وەربگری‌و، بیکەی بە نامیلکەیەکی سود بەخش، بۆ گەلی کوردی موسوڵمان، خوایە لە خۆم و، دایك و، باوکم و، خۆشەویستانم خۆش بە: خوایە لە سەر ئەم (عقیدە)یەم بمرێنە کە لەم نامیلکەیەدا نووسیومە، خوایە بۆ وەلام دانەوەی ناو گۆرەکەم یارمەتیم بدەو، گۆرەکەم بۆ بکە باغی بەهەشت.خودایە لە مەیدانی مەحشەر لە ژێر سێبەری خۆت دامبنێ و، وەلامی پرسیارەکانم بۆ ئاسان بکە، خوایە: نوسراوی کردەوەکانم بدە ئەودەستە راستەم، کە ئەم نامیلکەیەم پێ نوسیوە، ئەم نامیلکەیەش لەگەڵ چاکەکانی تر، بۆم لەناو لاتەرازوی چاکە دابنێ‌و، بە گەورەیی خۆت بۆم گران بکە، خودایە وام لێ نەکەی لە حەوزی کەوسەر دەربکرێم، خوایە بە ئاسانی لە پردی جەهەننەم دەربازم بکەو، خۆم و، دایك و باوکم، بە بەهەشت شاد بکە، آمین

**عبدالله عبدالعزیز هەر تەلی**

**هەولێر ـ کوردستان**

**(٧)ی محرم (١٤١٤) کۆچی**

**(٥)ی پوشپەر (٢٦٩٣) کوردی**

**(٢٦) حوزەیران (١٩٩٣) زایینی**



www.iqra.ahlamontada.com

## ناوەڕۆكی «عەقیدە»ی ئیسلام





www.iqra.ahlamontada.com

# ئەم نامیلکەیە

● عەقیدەیەکی ئیسلامی‌یە، لەسەر رارەوی ﴿اَهْل السُّنَّةِ وَالْجَماعَةَ﴾ بە گوێرەی تێگەیشتنی ﴿السَّلَفِ الصَّالح﴾رضي الله عنهم.

● بنچینــەکانی ئایین و، ڕوکنەکانی ئیمان و، ئیسلام بە درێژی روون ئەکاتەوە.

● باسی دادرەوایی ﴿حـاكِمِيـَّة﴾ی خوای گەورە ئەکا، کە تەنهـا خودا ماف یاسا دانانی هەیەو، کەسی تر ماف نیە، بەندەکانی خوا بکاتە بەندەی خۆی‌و، یاسای دەستکردیان بەسەردا بسەپێنێ.

● باسی تاك و تەنیایی ﴿وَحْدانِيَّة﴾ی خوا ئەکا، لە ﴿ذاتُ وصفــات﴾ و، لە ﴿اُلُـوهيَّـة﴾ و ﴿رُبُـوبِيَّـة﴾ خوایـەتی‌و، پەروەردگاریەتی دا.

● هەر چوار جۆری ﴿كُفْر﴾ی تێدا روون کراوەتەوە.

● باسی پێشەوای موسولمانان و ﴿جِهاد﴾و، دۆستایەتی‌و، دوژمنایەتی﴿اَلْوَلاء وَالْبَراءة﴾روون ئەکاتەوە.

● لە نیشانەکانی دونیا وێران بوون و، بەسەرهاتی دوای مردن و، روداوەکانی ﴿قیامة﴾ ئاگادارت ئەکاتەوە.

● لە هەموو بابەتێك بەڵگەی بەهێز، لە قورئان و حەدیس لەبەرچاوە.

نرخ ( ٣٠ ) دینارە

چاپخانا رۆشنبیری هەولێر

ژمارەی سپاردن ٢٤/ لە ٧/٧/١٩٩٤

www.iqra.ahlamontada.com